# پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان

# هەرێمی کوردستان

# و

# تورکیا

# ١٩٩١ ـ ١٩٩٨



هێرش عەبدوڵلا حەمەکەریم

مەڵبەندی کوردۆلۆجی

- کتێب : پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان
  هەرێمی کوردستان و تورکیا ١٩٩١-١٩٩٨
- بابەت : مێژوو
- نووسینی : هێرش عەبدوڵڵا حەمەکەریم
- کۆمپیوتەر : نووسەر
- پێداچوونەوەی زمانەوانی: د.کەمال عەلی
- هەڵەبڕی و وردبینی: مژدە ئەحمەد حەسەن
- دیزاین : بڕیار فەرەج کاکی
- بەرگ : رەنج
- ژمارەی سپاردن : ١٠٣١، ساڵی ٢٠٠٧
- تیراژ : ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٣٠٠٠ دینار
- زنجیرە: ١٢

مەڵبەندی کوردۆلۆجی

ناونیشان: گردی ئەندازیاران- گەڕەك/١٠٥، کۆڵان/٢٥، ژ.خانوو/٤، ژ. پۆست/٩٥

تەلەفون: ٣١٩٣٠٩٣ – ٣١٩٣١٧٥

Kurdology2006@yahoo.com

# ناوەرۆک

# پێشەکی

- **هۆکارەکانی هەڵبژاردنی بابەتەکە:**

ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٩٠ بایەخێکی زۆریان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەبوو،چونکە دوو گۆڕانی گەورەیان هێنایە کایەوە، یەکەمیان کۆتایی بە جەنگی سارد هێنا کە جەنگێکی درێژخایەنی جیهانی بوو ١٩٤٥-١٩٩٠،.بە هۆیەوە جیهانی لە سیاسەتی دابەشبونو دوو جەمسەری دەرکرد و یەکێتیی سۆڤیەت شکستی خواردو دووەم داگیرکردنی کوەیت بوو لەلایەن عێراق، کە ڕێگەی بۆ ئەمریکا خۆش کرد وەك هێزێکی براوە لە جەنگی سارد، باڵادەستیی خۆی بە شێوەیەکی تاك جەمسەری لە جیهاندا بەرجەستە بکات.

لەم دۆخەوە هاوکێشە نێودەوڵەتییەکان گۆڕانکارییان بەسەردا هات و، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەم کاریگەرییە بێبەش نەبوو، هەروەها کوردستانی باشوورو تورکیاش پشکی شێریان لەم گۆڕانە بەرکەوت. کورد بۆ یەکەمجار لە دوای چاوەڕوانییەکی ١٤٠ ساڵی، ,واتە دوای ڕووخانی دوا میرنشینیی کوردی هەلی دەسەڵاتی سەربەخۆی بۆ ڕەخساو بارودۆخی نێودەوڵەتیی بە قازانجی ئەو کەوتەوەو توانی لە سایەیدا دەسەڵاتێکی کوردی بە ناوی هەرێمی کوردستان پێکبهێنێت، هاوکات تورکیا ئەو هەلەی بۆ هەڵکەوت کە ڕۆڵێکی ناوچەیی بگێڕێتو ئەو کەنارگیرییەی لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانییەوە پیادەی دەکرد، تێپەڕێنێت.

لەگەڵ ئەوەی کوردو تورك وەك دوو نەتەوەی هاوسێ مێژوویەکی زیاتر لە پێنج سەدەی پێکەوە ژیانیان هەیە، بەڵام ئەو ڕابردووە گەلێك کێشەی بۆماوەیی بۆ جێ هێشتووە، بەتایبەت لەوەدا کورد تورکیای وەك ستەمکارێك دەبینی کە هۆکاری سەرەکی بە دەوڵەت نەبوونی بووە، لەم خاڵەوە ئارەزووەکانی هەرێمی کوردستان بۆ دەوڵەت، تورکیا بۆ بە هێز بوون، وەك دوو دەسەڵاتی دراوسێ بێ تەنگەژە نەبوو.

- **بایەخی توێژینەوەکە:**

بایەخی ئەم توێژینەوەیە پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا لە ١٩٩١-١٩٩٨ لەوەدایە کە باس لە قۆناغێکی مێژووی ئەزمونی دەسەڵاتی کوردو تورك دەکات، بە دوور لە بیروباوەڕی نەتەوەییو مێژووی ئاڵۆزی نێوانیان، هەردوولا لەژێر زەبری

کاریگەری ڕووداوە نێودەوڵەتیی و ناوچەییەکان، جۆرە پەیوەندییەکی سیاسیی تایبەت پێکدەهێنن.

پاڵنەری سەرەکی توێژینەوەکە ئەوەیە شێوەو بنەماکانی پێکهاتەی هەرێمی کوردستانو پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا، تاڕووخانی ڕژێمی پێشووی عێراق لە ٢٠٠٣ ڕوون بکاتەوە، لەو مێژووە بەدواوە بنەماکانو پێکهاتەو پەیوەندییە تایبەتییەکانی گۆڕانییان سەرەکی بەسەردا هاتو تورکیا هیچ پابەندییەکی بەرامبەر هەرێمی کوردستان نەما. لەلایەکی تریشەوە ماوەی توێژینەوەکە ١٩٩١-١٩٩٨ بۆ ئەو هۆکارە دەگەڕێتەوە کە ئەم ماوەیە پەیوەندییەکان دروست دەبنو بنەماکانیان دەچەسپێن، هەروەها دەگەنە قۆناغی ئاڵۆزبونو پاشان ئاسایی بوونەوە.

- **میتۆدی توێژینەوە:**

بۆ بابەتی ئەم توێژینەوەیە سوود لەچەند ڕێبازێك وەرگیراوە، کە بە شێوەیەکی سەرەکی ڕێبازی مێژووییەو بریتییە لە کۆکردنەوەی سەرچاوە، پاشان هەڵسەنگاندنیانو دواتر بەراوردکردنی زانیارییەکانو دواجار بڕیاردان لەسەر ڕووداوەکان. هەروەها هەوڵدراوە ڕەچاوی ڕێبازی زانستیی جوگرافیای سیاسیی بکرێتو دواجار لە هەندێ شوێن سوود لە زانستی یاسا وەرگیراوە.

- **گرفتەکانی توێژینەوە:**

ئەم توێژینەوەیە وەك سروشتی توێژینەوە مێژووییەکان، گرفتی سەرچاوەی هەبووە، هەروەها کێشەی زمانو وەرگێڕانی سەرچاوە لە زمانی تورکییەوە بۆ کوردیو بە دەستنەکەوتنی، چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسایەتیی کوردی پەیوندیدار بە بابەتەکە نەکراوە.

- **سەرچاوەکانی توێژینەوە:**

نوسینەکانی دکتۆرو پسپۆڕی ئەم بوارە محەمەد نورەدین وەك سەرچاوەی سەرەکی وەرگیراوە، چونکە نووسەر وەك کەسایەتییەکی شارەزاو بێلایەن بە پشتبەستن بە سەرچاوە تورکییە ڕەسەنەکان دوو پەرتووکی بە ناوی ترکیا فی زمن المتحول قلق الهویة وصراع الخیارات، ترکیا الجمهوریة الحائرة مقاربات فی الدین والسیاسة والعلاقات الخارجیة نووسیوە، هەروەها نووسەر گۆڤاری شؤون ترکیة ی ئامادەکردوە کە زۆرینەی بابەتەکانی لە سەرچاوەی ڕەسەنی تورکی وەرگرتووە. هاوکات سەرچاوەیەکی تر کە هەوڵدراوە کەلێنی بابەتەکەی پێ پڕبکرێتەوە، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ یە کە زنجیرەی ڕووداوەکانی تۆمارکردووەو زۆرێك لە

راوبۆچوونی سەرکردایەتیی کوردی تیادا باسکراوە، بەتایبەت لە میانەی شەڕی ناوخۆدا کۆمەڵێك نهێنی ئاشکرا کردووە. هەروەها سەرچاوەی ئەنتەرنێت سوودێکی زۆری بەخشیوە بە بابەتەکەو بە هۆیەوە گەلێك گۆڤارو رۆژنامەی جیهانیو بەڵگەنامە، بەردەستکەوتوون.

## • پێکهاتەی توێژینەوەکە:

توێژینەوەکە چوار بەشی لە خۆگرتووە، لە بەشی یەکەمدا بنەماکانی پەیوەندیی نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا، لە رووی جوگرافیای سیاسییەوە باس لە پێگەی هەردوولا کراوە، پاشان باس لە پێکهاتەی سیاسییو دانیشتوانو ولایەنی سەربازیو ئابووریو کێشە مێژووییەکان کراوە، لە میانەیدا خاڵی لاوازو بەهێزو نەگۆڕی سیاسیی ئاماژەی بۆ کراوە.

بەشی دووەم لە سێ تەوەرەدا مێژووی پەیوەندییەکانی نێوان عێراقو تورکیا دەخاتە روو لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٢٦-١٩٩٠ ، هەروها بایەخ بە کاریگەری ئەو پەیوەندیانە لە سەردەمی حکومەتە جیاوازەکانی ئەو دوو دەوڵەتە، لە سەر باشووری کوردستان، دراوە.

بەشی سێیەم وەك کرۆکی توێژینەوەکە درێژەی رووداوو رێکەوتنو جیاوازیو هاوکاریی نێوانیان باسکراوە،ماوەی ١٩٩١-١٩٩٢ بناغەی پەیوەندییەکان دارێژراوە، لە ١٩٩٢-١٩٩٤ هاوکاریی هەمەلایەنە کەوتۆتە نێوانیان، لە ١٩٩٤-١٩٩٦ کە سەرەتای گرژیو ئاڵۆزییەکانە ئاماژەی بۆ کراوە، هەروەها ١٩٩٦-١٩٩٨ کە ترۆپکی تێکچونی جۆری پەیوەندییەکانو پاشان خاوبونەوەی گرژییەکانە.

لە بەشی چوارەمدا کاریگەری نێودەوڵەتیی لە سەر پەیوەندیی نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا خراوەتە روو، عێراقو سوریاو ئێران وەك دەوڵەتانی ناوچەیی، ئەمریکا وەك تاکە زلهێزی جیهانیو خاوەنی پرۆژەی هاوکاریی نێوان هەردوولا، بە نموونەی سەرەکی وەرگیراوە.

# بەشی یەکەم

## بنەماکانی پەیوەندیی نێوان
## هەرێمی کوردستان و تورکیا

سروشتی پەیوەندییەکانی نێوان دوو لایەن لە سەر کۆمەڵێك بنەما بەندە، لاوازیو بەهێزی یان ڕێژەی بەتینیو سستی، جۆرو شێوەی پەیوەندییەکان دیاری دەکەن. دیارە مەبەست لەو بنەمایانە لایەنی سیاسییو سەربازیو مێژوویيو جوگرافیو ئابووریو ...هتد دەگرێتەوە، کە هەوڵدەدەین لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستانو تورکیا ئەو بنەمایانە دەست نیشان بکەینو پاشان بەراوردییەك لە نێوانیاندا ئەنجام بدەین.

## بنەمای یەکەم: جوگرافیای سیاسیی

هەرێمی* کوردستان، چەمکێکی جوگرافیو سیاسییە، بە باشووری کوردستان دەوترێت کە رووبەرەکەی ٧٣,٦١٨ کم[١][٢]، لە ساڵی ١٩٢٦[٢] بە فەرمی بە دەوڵەتی عێراقەوە لکێنراوە، بەڵام هەرێمی کوردستان وەك چەمکێکی سیاسی کە لە ساڵی ١٩٩١دا دوای کشانەوەی دامودەزگاکانی حکومەتی بەغداد نیمچە سەربەخۆییەکی بەدەست هێنا، لە لایەن دەسەڵاتی سیاسیی کوردییەوە بەڕێوە براوەو رووبەرەکەی ٤١,٩٣٩ کم[٢] بووە، واتە هەموو سنووری جوگرافی باشووری کوردستانی نەگرتۆتەوە[٣]، ئەم هەرێمە لە ٩٪ ی خاکی عێراقە[٤]، بەپێی نەخشەی رێکخراوی نێودەوڵەتیی unicef، کە لە ساڵی ١٩٩٧ کێشاویەتی، کەوتووەتە نێوان هێڵی پانی ٣٨ و ٣٤ و هێڵی درێژی ٤٠ و ٤٧، ئەم هەرێمە پارێزگاکانی هەولێر پایتەختی هەرێم و سلێمانیو دهۆك، قەزای ئاکریو شێخانو ناحیەی ئەتروشو بەردەڕەش لە پارێزگای موسڵ، قەزای کفریو ناوچەی سەرقەڵاو پشتقەڵا لە پارێزگای دیالەو هەندێ ناوچەی بچووك لە پارێزگای کەرکوکی دەگرتەوە، بەڵام هەندێ ناوچەی تری پارێزگای هەولێر وەك قەزای مەخمور، دیبەگە لەدەرەوەی ئەم هەرێمە بوون[٥].

هەرێمی کوردستان سنوورێکی هاوبەشی لەگەڵ هەریەك لە عێراق بەدرێژی ٦٥٠کم، ئێران ٥١٣کم، سوریا ١٠کم، تورکیا ٣٧٧کم هەیە[٦]، ئەوەی سنووری تورکیا لە سنووری دەوڵەتە دراوسێکان جیا دەکاتەوە، بەپێی رێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتیی ساڵی ١٩٢٦، لە نێوان عێراقو تورکیا دیاری کراوە، لە رووی سروشتییەوە زنجیرە شاخێك بە ناوی چیای

---

* هەرێم: رووپێوێکی زەمینە، روخسارو خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیەو ئەو روخسارو خاسیەتە تایبەتانە یەکپارچەیی بەرجەستە دەکەن، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ئازاد محمد أمین نەقشبەندیو ئەوانی تر: جوگرافیای هەرێمی کوردستان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٨، ل/١٣.

1 جزا توفيق طالب : المقومات الجيوبولتيكيه للامن القومي في أقليم كردستان، مركز دراسات استراتيجيه كردستان، للدراسات الاستراتيجيه، السليمانيه، ٢٠٠٥، ل/٢٠ .

2 بڕوانە دەقی رێکەوتننامەکە، پاشکۆی ژمارە/١ .

3 كوردستان نبذة تأريخية جغرافية اقتصادية، مكتب الدراسات والبحوث المركزي، مطبعة وزارة التربية، أربيل، ١٩٩٨، ل/٦٣.

4Carole A. O'Leary: THE KURDS OF IRAQ: RECENT HISTORY, FUTURE PROSPECTS. *Middle east Review of International Affairs*. Volume 6, No. 4 - December 2002 ..www.meria.idc.icil

5 ئەم نەخشەیە لەساڵی ١٩٩٧ کێشراوە، بەڵام پێش ئەم مێژووە، سنووری هەرێمەکە لەگەڵ عێراق، بەپێی بارودۆخی سیاسیی ناوچەکە لەگۆڕاندا بووەو بارێکی جێگیری نەبووە، بڕوانە نەخشەی ژمارە/١ :

UNICEF, ARBIL. 10 APRAL 97

6 جزا توفيق طالب: المقومات الجيوبولوتيكيه، ل/٢٤١" سنووری سوریاو عێراقو ئێران بەهاوکاریی بەشی جوگرافیا، کولێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سلێمانی، پێوانە کراوە.

تۆرۆس دیاری دەکات، بەرزترین لووتکەی شاخی زۆزانە کە ٢٤١١م بەرزە[1] لای رۆژهەلاتی ئەم چیایە بەرزو سەختەو هەتا بەرەو رۆژئاوا بڕوات نزم دەبێتەوە، ئەم سنوورە لە رۆژهەلاتەوە لە خاڵی حاجی بەگ دەست پێدەکاتو بە چەندین شاخو دۆڵدا رووەو رۆژئاوا دەڕوات، دۆڵی روەکوچكو ناوچەی دۆسكیو شاخی ژیریو زۆزان دەبڕێت تا دەگاتە رووباری خاپورو ئەم رووبارە دەبێتە هێڵی سنووری تا دەگاتە ناوچەی فیشخاپور، لێرەوە سنووری نێوان هەرێمی کوردستانو سوریا دەست پێدەکات[2] .

بایەخی جوگرافیای سیاسیی لە نێوان تورکیاو هەرێمی کوردستان دوولایەنە بووە:

**١. بایەخی جوگرافیای هەرێم بۆ تورکیا:**

بایەخی جوگرافیای ئەم هەرێمە، لە رۆژی دروستبوونییەوە دەست پێدەکات، کاتێك لە ئەنجامی دووەمین جەنگی کەنداو لە ساڵی ١٩٩٠-١٩٩١ دانیشتوانی باشووری کوردستان لە بەرامبەر دەسەلاتی ناوەندیی بەغدادا، نارەزایی خۆیان بە راپەڕینو کۆڕەو دەربڕی، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بە شێوەیەکی گشتی کە دژ بە دەوڵەتی عێراقی لە شەڕدا بوو، بۆ دەست بەستنی عێراق لە رەشەکوژی کردنی خەڵکی هەرێم، بڕیاری ژمارە ٦٨٨ ی دەرکرد[3]، دواجار بەهۆی پێکهێنانی هێزێکی نێودەوڵەتیی لە بنکەی ئەنجەرلیك ی ناو خاکی تورکیا، هەرێم مافی پاراستنی نێودەوڵەتیی بەدەست هێنا[4] .

ئەم هەرێمەی کوردستان بایەخی تایبەتی هەبوو بۆ تورکیا لەوانە:

- هەرێمی کوردستان دوور لە دەسەلاتی عێراق، سنوورێکی ٣٧٧کم ی لەگەڵ تورکیا بەدەستەوە بوو، هیچ جۆرە خاڵێکی سنووری هاوبەش لە نێوان تورکیاو عێراقدا نەما، لە بری عێراق بوو بە دەوڵەتی دراوسێی تورکیا.
- ئەم هەرێمە بەهۆی بڕیاری ٦٨٨ ی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەربەخۆیی بەدەست هێناو بە کوردستانی سەربەخۆ ناوزەد کرا[5]، بە واتایەکی تر هەرێمی کوردستان بەبێ ئەوەی سەر بە هیچ دەوڵەتێك بێت، وەك کاری کردە-de facto لە ژێر زەبری گۆڕانکارییەکانی دوای

1 ئازاد محمد أمین نەقشبەندیو ئەوانی تر: جوگرافیای هەرێمی کوردستان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٨، ل/٥١.

2 نصیف جاسم المطلبی: موقع تورکیا الجیوستراتیجی وأهمیته للعراق، رسالة دکتوراه غیر منشورة، قسم الجغرافیا، کلیة الآداب، جامعة بغداد، ١٩٨٦، ل/٢٠٨.

3 بڕوانە دەقی بڕیارەکە، پاشکۆی ژمارە/٢ .

4 درێژەی ئەم باسە لەبەشی سێیەم، تەوەرەی یەکەمدا باسکراوە.

5Chris Kutschera: The Kurds' Secret Scenarios. Middle East Report, www. MERIP, Org/mer. Htm.

جەنگ خۆی سەپاند، تورکیا نەیدەتوانی خۆی لەو راستییە لابدات، پێویست بوو وەك هەرێمێکی جوگرافی هاوسنوور مامەڵەی لەگەڵدا بکات[1].

ئەمە لە کاتێکدا بوو خودی دەوڵەتی تورکیا بە سەرکردایەتیی تورگۆت ئۆزاڵ لە بواری فراوانبوونو گۆڕانو کرانەوەدا بوو، نەك تەنها بە رووی هەرێمی کوردستاندا، بەڵکو بە رووی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بە گشتی.

ئەم بارە نوێیەی تورکیا کەوتبووە ژێر کاریگەری چەند فاکتەرێکەوە:

أ. لەگەڵ هەلوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩٠دا، هەڕەشەی ٤٥ ساڵەی جەنگی سارد ١٩٤٥-١٩٩٠ لە سەر تورکیا وەك دەوڵەتێکی سەر بە بلۆکی رۆژئاوا، نەما.

ب. بیری فراوانبوونی تورکیا لە سەرەتای نەوەدەکاندا لە برەودا بوو، نەخشەیەکی نوێ تەشەنەی کرد تیایدا جگە لە هەرێمی کوردستان، کۆمارە تازەکانی ئاسیای ناوەڕاست، تورکمانستان، ئوزبەکستان، تاجیکستان، قیرغیزستان، کازاخستان ی لەخۆ گرتبوو، ئەم نەخشەیە بە ناوی "تورکیا لە سەدەی ٢١دا" لەژێر دروشمی "هێزێکی نوێ لە دایك دەبێت" بڵاوبووە[2]، تۆرگۆت ئۆزال لە کاتی کرانەوەی یەکەم پرۆژەی گاب لەساڵی ١٩٩٢ رایگەیاند، کە سەدەی٢١، سەدەی تورکیا دەبێت[3]. لەم سۆنگەیەوە تورکیا لەو باوەڕەدا بوو (پیاوە نەخۆشەکە)ی*سەرەتای سەدەی بیستەم، لە سەدەی بیستویەکەمدا دەبێتە گەورەترین هێزی جیهانی.

ت. لە ئاکامی جەنگی کەنداودا، عێراق شکستی هێناو هێزە سەربازییەکەی لە ناوچەکەدا لاواز بوو، هەروەها تەواوی دەسەلاتی لە هەرێمی کوردستان لە دەست دا، ئەمە هەلێك بوو لە بەردەم تورکیادا بۆ فراوان کردنی هێزی سیاسیی خۆی لە هەرێمی کوردستان.

پ. لە سایەی سیستەمی نوێی جیهانی * بە سەرکردایەتیی ئەمریکا، تورکیا وەك هاوپەیمانێك تەریب بە سیاسەتی ئەو دەوڵەتە، ستراتیجی کاری بەرەو رۆژهەلاتی ناوەڕاست

---

1 ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق: پرۆتۆکۆلەکان، بەرگی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٢، ل/٢٠٥.

2 أصغر جعفر ولدانی :جشم داشتهای ترکیة بةشمال عراق، بش دوم، مجلة اطلاعات سياسي اقتصادي شماره ٩٨-٩٧، ل/٥٠.

3 محمد نور الدين: تركيا في زمن المتحول قلق الهوية وصراع الخيارات، رياض الريس للكتب والنشر، لندن١٩٩٧، ل/١٤٨.

*ئەم چەمکە یەکەم جار لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم لە لایەن قەیسەری روسیا بەکارهات لەبەرامبەر سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی، بەهۆی لاواز بوونی دەوڵەتەکەی، بەردەوامیش لەناوەندی نێو دەولەتی دا بەکار دەهات تاساڵی لەناوچوونی دەوڵەتی عوسمانی لە ١٩٢٣ .

*بۆ یەکەم جار ئەم چەمکە لە ١١/ سێپتەمبەر/١٩٩٠ دا لەلایەن سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بۆش بەکارهات.

گۆڕی، بە واتایەکی تر هاوپەیمانیی نێوان ئەمریکا وەك بەهێزترین دەوڵەتی جیهانو تورکیای لاواز لە ئاستیدا، بەدوای خۆی ستراتیجی ئەنقەرەی بەرەو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕاپێچ کرد[1] .

لەم نێوەندەدا تورکیا خۆی لە بەردەم ڕمانی یەکێتیی سۆڤیەتو بەزینی عێراقو ماندوو بوونی ئێران لە یەکەمین جەنگی کەنداودا ۱۹۸۰-۱۹۸۸ بینیەوە، هەموو ئەمانە ئەو باوەڕەیان لای تورکیا دروست کرد کە هەلومەرج لەبارە بۆ خۆدەرخستن وەك هێزێکی گەورە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

### ٢. بایەخی جوگرافی تورکیا بۆ هەرێم:

هەرێم لە رووی پێگەی فەلەکییەوە، بە بەراورد لەگەڵ تورکیا لاوازە، بە شێوەیەك رووبەری تورکیا ٧٦٦٦٤٠کم[2]، کەوتووەتە نێوان هێڵی پانی ٣٦-٤٢، هەروەها هێڵی درێژی ٢٦-٤٥[2]، لە ٦ بازنەی پانیدا پانتایی داگیر دەکات، ئەمە کاری کردووەتە سەر جۆراوجۆری ئاووهەوای تورکیاو ڕەنگدانەوەی لەسەر چالاکبوونی مرۆییو ئابووری لە کاتێکدا هەرێمی کوردستان نەدەگەیشتە پڕکردنەوەی ٣ بازنەی پانی، کە وایکرد بوو هەرێم پێویستی بە تورکیا بێت.

پێگەی هەرێمی کوردستان لە رووی دوورونزیکی لە ئاوی دەریاوە لاوازە، هیچ دەروازەیەکی ئاوی نییە، بە جۆرێك لە رووی چالاکیو پەیوەندیی ڕاستەوخۆ لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا دابڕاوە، تەنها لە ڕێگەی دەوڵەتە دراوسێکانەوە دەتوانێ پەیوەندییەکانی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت. لەم لایەنەوە بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بە تورکیا بەستووە، چونکە زۆرترین کەناری ئاوی هەیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستداو درێژیی کەناراوەکانی ٨٢٣٣کم[3] دەبێت، جگە لەوە نزیکترین کەناری ئاوی لە هەرێمەوە کەنارەکانی تورکیابوو بە رووی دەریای ناوەڕاستدا. جگە لەمە تورکیا یەکەم دەوڵەتی ئاسیا بوو بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە رووبەری ٢٣,٧٦٤/کم[2] بەندبوو بە ئەورووپاوە[4]، کە ڕۆڵی پردی پەیوەندییەکانی دەگێڕا لە نێوان هەرێمی کوردستان لەگەڵ ئەورووپاو ئەمریکا.

هەرێمی کوردستان لە باشوورەوە هەمیشە لە ژێر هەڕەشەی عێراقدا بوو، لە ڕۆژهەڵات ئێرانو لە ڕۆژئاوا سوریا، چونکە وەك تورکیا لە پاراستنی هەرێمی کوردستان لە دژی عێراق

---

١ جیهانگیر کرمی: گزارش از تحولات شمال عراق در ۱۹۹۰ ٧٦-١٣٦٩ ، مجله سیاست دفاعی ، شماره ٢١-٢٠، ١٣٧٦، ل/٢١٣.

٢ إبراهيم خليل أحمد وآخرون: تركيا المعاصرة، دار الكتب للطباعة والنشر، موصل، ١٩٨٥، ل/٨.

٣ إبراهيم خليل أحمد وآخرون: تركيا المعاصرة، ل/٧-٨.

٤ نصيف جاسم مطلبي: موقع تورکيا الجيوستراتيجية، ل/٢١.

هەرێمی کوردستان لە باشوورەوە هەمیشە لە ژێر هەڕەشەی عێراقدا بوو، لە ڕۆژهەڵات ئێرانو لە ڕۆژئاوا سوریا، چونکە وەك تورکیا لە پاراستنی هەرێمی کوردستان لە دژی عێراق بەشدار نەبوون، لە کاتێکدا تورکیا خاکەکەی لە لایەن هاوپەیمانانەوە بەکار دەهاتو سوپاکەی لە پاراستنی هەرێمەکە بەشدار بوو[١].

هەموو ئەمانە وا دەکەن تورکیا جێگەی بایەخ بێت بۆ هەرێمی کوردستانو یەکەم سەرەك وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان محەمەد فوئاد مەعصوم لەم بارەیەوە رای گەیاند: "تورکیا کەناڵی ژیانی ئێمەیە، بەبێ تورکیا ئێمە دەسەوسان دەبین"[٢]. لێرەدا فراوان بوونی دەسەڵاتی تورکیا لە هەرێمی کوردستان ستراتیجێك بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا ترسێکی لەپشتەوە بوو، چونکە وەك سەرۆکی پارتی کرێکارانی تورکیا دەڵێت: "کارەکانی ئەمریکا لەناوچەکەدا ئەوەی بۆ تورکیا دەرخست، یان دەبێت بەرەو گەورەبوون گەشە بکات، یان دەبێت بچوك ببێتەوە"[٣]. بە مانایەکی تر ئەگەر تورکیا مامەڵەیەکی واقیعی لەگەڵ هەرێمی کوردستان نەکات ئەوا دور نییە خودی تورکیا لە بەردەم نەخشەی دابەشبووندا بێت.

لەم سۆنگەیەوە تورکیا ئەوەی پەسەند کرد لەگەڵ هەرێم جۆرێك لە پەیوەندی ببەستێتو پرۆژەی ئەمەریکی لە ناوچەکەدا پەسەند بکات، بەڵام بە ناوی "باکووری عێراق" نەك بە ناوی "کوردستان"، ئەم شێوە وتارەی تورکیا تا ساڵی ٢٠٠٥ هەر بەردەوام بوو، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا وتی: "ناوێك نییە بە ناوی هەرێمی کوردستان"، هەمان ڕۆژ وەزارەتی دەرەوە رایگەیاند: "تورکیا دژی وڵاتێکی سەربەخۆیە بە ناوی کوردستان، وشەی کوردستان نە لە عێراق نە لە ئێران هیچ مانایەکی سیاسیی نییە"[٤].

---

1 رواء محمد ملا: سياسة التدخل الامريكي، دراسة الحالة في شمال العراق، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد، ١٩٩٨، ل/١٢٣-١٢٤.

2مجلة شؤون تركية : الاستقلال التدريجي لأكراد العراق في التقرير الامريكي، مركز الدراسات الإستراتيجية للبحوث ء التوثيق، عدد ٤ ، ١٩٩٢، ل/١٩

3 Dogu perincek: the northern Iraq operation: turkey entered u.s –supervised territory .Turkish daily news. april.1995.www.hartford-hmp.com

4 Ankara first: we don't know Kurdistan region. Then correction sabh Newspaper, 05 September; 2005

## بنەمای دووەم: بنەما سیاسییەکان

### ❖ سیستەمی سیاسیی تورکیا

چوارچێوەی دەستووری‌و یاسایی دروستکەری بڕیار لە تورکیا، یاسادانان‌و جێبەجێکردن‌و دادوەرییە، یەکەمیان لەژێر ناوی ئەنجومەنی نیشتمانی گەورەی تورکیا بەپێی دەستووری ساڵی ١٩٨٢ کار دەکات، ژمارەی کورسییەکانی پەرلەمان لە ساڵی ١٩٩٥ پێنج سەدو پەنجا کورسی بووە، ماوەی ئەندام پەرلەمان ٥ ساڵ بوو، جگە لە کاری یاسادانان سەرۆك کۆماری تورکیا بۆ ٧ ساڵ‌و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بۆ پێنج ساڵ دیاری کراوە[1]، پەرلەمانی تورکیا پابەندی دەستوورێکە گۆڕانی کەم تێدا دەکرێت‌و لە بەردەم پەرلەماندا بۆتە لەمپەرێك کە ڕێگرە لە بەردەم ژیانی ڕاستەقینەی دیموکراتیی پەرلەمانتاری[2] .

دەسەڵاتی دووەم لە تورکیا، جێبەجێکردنە و لە سێ لایەن پێکهاتووە:

- سەرۆك کۆمار، سەرکردەی سوپای تورکیایە، مافی ئەوەی هەیە پەرلەمان بانگێشت بکات بۆ ڕەتکردنەوەی بڕیارێکی پەرلەمان‌و لەبەردەمیدا بەرپرس نییە.
- ئەنجومەنی وەزیران، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لە لایەن سەرۆکی دەوڵەتەوە دیاری دەکرێت‌و لەلایەن پەرلەمانەوە متمانەی پێدەدرێت، دەستەڵاتی بڕیار دەرکردن‌و ڕێکخستنی باری سیاسیی‌و ئابووری‌و دارایی هەیە، هەروەها ئامادە باشکردنی سوپای تورکیا لە سنووری دەسەڵاتی سەرەك وەزیرانە[3] .

•ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی: لەسەرەك وەزیران، وەزیرانی بەرگری، ناوخۆ، دەرەوە، سەرەك ئەرکانی گشتی، سەرکردە سەربازییە باڵاکان، سەرکردەی سوپای ئاسایشی گشتی پێکدێت، بە سەرۆکایەتیی سەرۆك کۆمار کۆدەبێتەوە، ئەم ئەنجومەنە پێشنیار دەخاتە بەردەم ئەنجومەنی وەزیران، بەڵام لە ساڵی دامەزراندنییەوە ١٩٦١ زۆرینەی پێشنیارەکانی جێبەجێ کراون‌و ڕەت نەکراونەتەوە.

دەسەڵاتی سێیەم دادوەرییە، ئەرکی یەکلایکردنەوەی کێشەکانی لە ئەستۆدایە، گرنگترینیان: دادگای دەستووری، دادگای ئیستئناف‌و دادگای سەربازییە[4] .

1 جلال عبد لله معوض: صناعة القرار في تركيا والعلاقات العربية التركية، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٨، ل/١٦.

2 أندرو فنكل وآخرون: تركيا المجتمع والدولة، ترجمة: حمدي حمد وزميله، بيت الحكمة، بغداد ٢٠٠٠، ل/١٨٦-١٨٧.

3 إبراهيم خليل ویّخرون، تركيا المعاصره، ل/١٠٢-١٠٣.

4 جلال عبد لله معوض: صناعه القرار في [illegible] ل/٢١-٢٢.

هەریەك لەم سێ دەسەڵاتە رۆڵی گرنگی لە دروستکردنی بڕیاری سیاسیی تورکیادا هەیە، سەرەڕای دەسەڵاتە یاساییەکان، لایەنێکی گرنگی پێکهێنەری بڕیار پارتەکانن، گرنگترین ئەو پارتانەی لە نەوەدەکاندا رۆڵیان هەبووەو حکومەتیان بەڕێوە بردووە ئەمانە بوون:

١- پارتی رێگای راستDYP لە ٢٠ی نۆڤەمبەری١٩٩١-٢٠/ سێپتەمبەر/١٩٩٥ بە دوو کابینەی جیاجیا حکومەتی بەڕێوە بردووە.

٢- پارتی نیشتمانی دایك ANAP کە لە ٢٩/یونیۆ/١٩٩٧-١٩٩٩.

٣- پارتی رەفا RP لە ٢٩/یونیۆ/١٩٩٦- ١٨/یونیۆ/١٩٩٧.

هەریەك لەم پارتانە نەیان توانیوە زۆرینەی پەرلەمان بەدەست بهێنن، ناچار حکومەتی ئیئتلافییان پێکهێناوە، تا زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمان بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن[١] ئەمە هۆکاری لاوازی حکومەتەکانی تورکیا بوو، کە هەمیشە لە بەردەم هەڕەشەی هەڵوەشاندنەوەو ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێزدا بووە.

هەریەك لەم پارتانە خاوەنی قوتابخانەیەکی سیاسیی‌و پرۆژەی تایبەت بوون، سەرکردەی پارتەکان لەم نێوانەدا نەخشی تایبەتیان هەبوو، دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی لە بیرو بۆچوونی ئەم سەرکردانەوە، هەڵوێستی جۆراوجۆری ناو تورکیا بەرامبەر هەرێمی کوردستان بزانین:

تورگۆت ئۆزال ١٩٢٧-١٩٩٣[٢]: ماوەی دەسەڵاتی ١٩٨٣-١٩٩٣ لە مێژووی تورکیادا، بە قۆناغی ئۆزالی ناو دەبرێت، بە هۆی ئەو بیرو باوەڕانەی لە رووی نوێخوازی‌و کرانەوەوە لە بوارەکانی، ئابووری، کێشە درێژخایەنەکانی وەك ئیسلامی سیاسیی، کێشەی کورد، رۆڵی تورکیا لە ناوەندی نێودەوڵەتیی دەربڕیوە. تورگۆت ئۆزال یەکەم سەرۆك بوو لە مێژووی تورکیا، دەروازەی سیاسیی لە سەرکردایەتیی کورد لە ساڵی ١٩٩١ کردەوە، دەربڕی پرۆژەی فیدراڵی بوو بۆ کوردی تورکیا، هاوکات پشتگیری لە پێکهێنانی ناوچەیەکی ئارام لەلایەن هێزی هاوپەیمانەکانەوە کرد، کە پاشان بوو بە هەرێمی کوردستان[٣].

---

1 جلال عبد لله معوض: صناعة القرار في تركيا، ل/٣١٢-٣١٥.

2 کەسایەتیکی راسترەوی لیبرال بوو، پارتی نیشتمانیی دایك ی لەساڵی ١٩٨٣ دامەزراند، لەساڵی ١٩٨٣-١٩٨٩ سەرۆك وەزیران بوو، لەم مێژووە بەدواوە تاکۆچی دوایی لەساڵی ١٩٩٣ سەرەك کۆماری تورکیابوو.

3 وقائع تطور العلاقات بين تركيا والأكراد العراقيين، إعداد: محمد نور الدين، مجلة شؤون تركية ، عدد/ ٢ ، ١٩٩٢، ل/١٢.

سلیمان دیمیریل[1] : کەسایەتی سیاسیی دیمیریل بە جۆرێك بوو پشتگیری پەیوەندییەکانی تورکیای لەگەڵ ئەمریکاو کۆمەڵی ئەورووپی دەکرد، هەروەها باوەڕی بە پیشەسازیکردنی ئابووری تورکیا بوو، لەم روانگەیەوە دواکەوتوویی ئابووری باشووری رۆژهەڵاتی باکووری کوردستان، بە یەکەم هۆکاری دروستبوونی کێشەی کورد لە تورکیا دادەنا[2] تێڕوانینی بۆ هەرێمی کوردستان لە روانگەی پشتگیری کردنی پرۆژەی ئەمەریکی بوو لە ناوچەکەدا، بەڵام هەوڵی دەدا بۆچوونەکانی کار لەسەر لەنگ بوونی کەسێتی خۆیو پارتەکەی نەکات، چونکە لە لایەن سوپاوە دووجار لەکار خرابوو و خواستی نەبوو سێبارەی بکاتەوە، لەم روانگەیەوە هەوڵەکانی لە پێناوی راگرتنی هاوسەنگی بوو لە نێوان بەرنامەی سوپای تورکیو پرۆژەی ئەمەریکی لە ناوچەکەدا.

نەجمەدین ئەربەکان[3] : بنەمای پارتەکەی ئیسلامی بوو، دژی دور خستنەوەی ئیسلام بوو لە سیاسەت، رەخنەی لە بەرۆژئاواکردنی تورکیا دەگرت [4] هەروەها کێشەی کوردی لە بەرنامەی برایەتی ئیسلامی جێ دەکردەوە. سەبارەت بە هەرێمی کوردستان هەمیشە دژی نوێکردنەوەی مۆڵەتی هێزی هاوپەیمانان بوو بۆ پاراستنی هەرێمەکە لە ناو خاکی تورکیاوە[5] .

بوڵنت ئەجەڤیت[6] : لە نەوەتەکان بەردەوام لە ناو پەرلەمان گروپی فشار بووە، لە ساڵی ١٩٩٧ لە حکومەتی مەسعود یەڵماز جێگری سەرەك وەزیران بوو، لە بۆچوونیدا سەبارەت هەرێمی کوردستان، هاوڕای نەجمەدین ئەربەکان بوو[7] .

---

1 ساڵی ١٩٢٤ لەدایکبووە، کەسایەتییەکی راستڕەوی پارێزکارە، لە ١٩٦١-١٩٨٠ شەش جار بۆتە سەرەك وەزیران، لەو ماوەیەدا دوو کودەتای سەربازی بەسەردا کراوە لە ١٩٧١، ١٩٨٠ ، ساڵی ١٩٨٧ سەرکردایەتیی پارتی رێگای راستی کردووە، لە ١٩٩١-١٩٩٣ بووە بەسەرۆك وەزیران، لە ١٩٩٣-٢٠٠٠ سەرەك کۆماری تورکیا بووە.

2 جلال عبد الله معوض: صناعة القرار في ترکیا، ل/٣١-٣٧.

3 ساڵی ١٩٢٦ لەدایکبووە، کەسایەتیەکی ئیسلامی کۆنەپارێزە، ساڵانی ١٩٧٠-١٩٨٠ پارتی سیستەمی نیشتمانیی ، سەلامەتی نیشتمانیی پێکهێناوەو بەشداری لەهەڵبژاردنەکاندا کردووە، لەساڵی ١٩٨٧ بۆتە سکرتێری گشتی پارتی رفاه ، لەهەڵبژاردنی ساڵی١٩٩١، ٦١ کورسی پەرلەمانی بەدەستهێنا، بەردەوام بنکەی جەماوەری فراوانتربووە، لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٩٥، ١٥٨ کورسی بەدەستهێناوە، لەماوەی ٢٩/ یۆنیۆ/١٩٩٦-١٨/ یۆنیۆ/١٩٩٧ سەرۆکایەتی حکومەتی تورکیای کردووە.

4 محمد نور الدین : ترکیا الجمهوریة الحائرة، مرکز الدراسات الإستراتیجیة للبحوث ء التوثیق، بیروت، ٢٠٠١، ل/٩٠-٩٥.

5 بڕوانە بەشی سێ یەم ، تەوەرەی چوارەم . ل/١٤٠

6 ساڵی ١٩٢٤ لەدایکبووە، خاوەنی کەسایەتیەکی سۆسیالیستی کۆنەپارێز بوو. ساڵی ١٩٦٦، وەك سکرتێری گشتی پارتی گەلی کۆماری هەڵبژێردراوە، لە ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٩ سێ جار پۆستی سەرەك وەزیرانی وەرگرتووە، پشتگیری سیاسەتی رۆژئاوابوو بەمەرجێك بەرژەوەندییە نەتەوایەتییەکانی تورکیا بپارێزێت. لەساڵی ١٩٨٧، سەرکردایەتیی پارتی چەپی دیموکرات ی کردووە

7 جلال عبد الله معوض: صناعة القرار في ترکیا، ل/٩٥-٩٦ .

❖ **پێکهاتەی سیاسیی هەرێمی کوردستان**

هەرێمی کوردستان لە رووی سروشتی پێکهاتەی سیاسییەوە تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، ئەم هەرێمە کاتێك ساڵی١٩٩١ لە دەوڵەتی عێراقی دابڕا. بەغداد لای خۆیەوە ئەم دابڕانەی قووڵتر کردەوە، لە ٢٦/ئۆکتۆبەر/١٩٩١ دامودەزگا بەڕێوەبەرێتییەکانی کێشایەوە، بەرەی کوردستانی وەك خاوەن دەسەڵاتی سیاسیی بڕیاری دا دەسەڵاتێکی سەربەخۆی دوور لە عێراق پێکبهێنێت. بۆ ئەم مەبەستە لە ١٩/مایو/١٩٩٢ هەڵبژاردن ئەنجام درا، لە ٤/یونیو/١٩٩٢ پەرلەمان بە ناوی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق یەکەم دانیشتنی خۆی ساز کرد، گرنگترین بڕیاری پەرلەمان، دەرکردنی یاسای ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان و راگەیاندنی فیدراڵی بوو لە ساڵی١٩٩٢ دا[1] .

هەرێمی کوردستان لە رووی یاساییەوە دۆخێکی تایبەتی هەبوو، بەڕای عەبدولرەحمان سلیمان زێباری هەرێم دەوڵەتێکی سەربەخۆ نەبوو، چونکە: دەقێکی روونو ئاشکرا بۆ راگەیاندنی سەربەخۆیی نەبوو، خاوەنی وەزارەتی بەرگری نەبوو، بەڵکو دابەشبوونی نیزامی سوپاو هێزەکان بۆ سەرکردایەتییو هێزی پارتە سیاسییەکان گەڕاوەتەوە، خاوەنی وەزارەتی دەرەوە نەبووەو توانای ناردنەدەرەوەی نوێنەرو واژۆکردنی پەیماننامەو پێکهێنانی سەفارەتی نەبوو، دانشتوانەکەی خاوەنی رەگەزنامەی تایبەتی هەرێم نەبوون بەڵکو هەڵگری رەگەزنامەی عێراقی بوون[2] .

سەرەڕای ئەوەی ئەم هەرێمە خاسیەتی دەوڵەتی یاسایی نەبوو، هاوکات بە مانا یاساییەکەی هەرێمێکی فیدراڵی نەبووە، چونکە عێراق خاوەنی دەستوورێکی ناوەندی بوو، هەروەها دەسەڵاتی یاسادانانو جیبەجێکردنو دادوەری لە نێوان حکومەتو هەرێمدا دابەش نەکرابوو، دواجار چەمکی هەرێمی کوردستان مانایەکی سیاسیی لەخۆ گرتبوو، نەك ئەندامێك بێت لەدەوڵەتی فیدراڵیدا[3] .

لەم سۆنگەیەوە، عەبدولرەحمان سلیمان زێباری باری یاسایی هەرێمی کوردستانی لە ئاستی تایوان بەراورد کردووە، کە لە ناوەندی نێودەوڵەتی بە کیانێکی جۆری ناوازە- ناوزەد کراوە Entity sui generics، خاوەنی دەسەڵاتێکی سەربەخۆ بووەو توانای ئەوەی

---

1 کوردستان، نبذة تاريخية جغرافية اقتصادية، مكتب الدراسات والبحوث المركزي، ل/٦٤-٦٥.

2 عبد الرحمن سليمان الزيباري: الوضع القانوني لإقليم كوردستان العراق في ظل قواعد القانون الدولي، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، ٢٠٠٠، ٥٠٧-٥١٠ .

3 هەمان سەرچاوە، ل/٥١٩-٥٢١.

هەبوو پەیوەندیی دەرەکی ببەستێت[1]، لەم رووەوە مارف عومەر گوڵ پێیوایە حکومەتی هەرێمی کوردستان بە شێوەیەکی فەرمی کەسایەتیی یاسایی نێودەوڵەتیی لە پەیوەندیی دەرەوە لە میانەی پەیوەندیی دیپلۆماسیو یاسایی، لەگەڵ رێکخراوە نێودەوڵەتیەکان پیادە کردووە[2]، سەبارەت بەهەمان بابەت کۆمەڵێك زاناو پسپۆری بێگانە بەم شێوەیە ناوی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان دەبەن:

میشیل گوتنر - پسپۆر لە بواری دەستووری دەوڵەتاندا لە نوسینەکانی تایبەت بە کورد وەك دەوڵەتی واقیعی کوردستان-The de facto state of Kurdistan ناوی هەرێمەکەی بردووە[3].

هنری بارکی و گراهام فۆلەر لە توێژینەوەیەکیاندا سەبارەت بە کورد بە ناوچەی واقیعی ئۆتۆنۆمی کوردستان-A de facto Kurdish autonomous zoon ناویان هیناوە[4].

هەروەها دکتۆرێکی یاساناسی تورکی بە دەوڵەتی کوردی لە باکووری عێراق ناوزەدی کردووە[5].

لەم لێکۆلینەوەی ئێمەدا چەمکی هەرێمی کوردستان بە بێ وشەی عێراق، بەکار دەهێنرێت وەك دەسەڵاتێکی سیاسیی سەربەخۆی کوردیی دابڕاو لەو دەوڵەتە.

دروستکەری بڕیاری سیاسیی لە هەرێمی کوردستان بە هەمان شێوەی باری یاسایی تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، پەرلەمان بە ناوی ئەنجومەنی نیشتمانی هەرێمی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٢دا پێکهات، ژمارەی کورسییەکانی ١٠٥ کورسی بوو، بە شێوەی پەنجا کورسی

---

1 تایوان لەساڵی ١٨٩٥، لەئەنجامی شەرێکدا چین دەسبەرداری بووە بۆ یابان، لەساڵی ١٩٥١ دەستی لەهەموو مافیك کێشایەوە، دواتر تایوان بەسەربەخۆیی مایەوە، بەبێ ئەوەی بچێتەوە سەر چین، جۆرە پەیوەندییەکی دیپلۆماسی تایبەتی لەگەڵ دەوڵەتان هەیە، هاوکات لەرووی نێودەوڵەتیشەوە وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ دانی پیادا نەنراوە. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل/٥١٩-٥٢١.

2 مارف عومەر گوڵ: کێشەی کەسایەتی یاسایی نێو نەتەوەیی کورد، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل/١١١

3 Michael M. Gunter: The Kurdish question in perspective FindArticles > World Affairs > Spring 2004 > Article www.find articles. Com

4 Henri J. Barky and, Graham E. Fuller; Turkeys Kurdish Question Rowman, and Lihlefield Publishers. New York, 1998, 23.

5 عبد الرحمن سليمان زيباري: الوضع القانوني لإقليم كوردستان العراق ، ل/٥٣٥

بۆ یەکێتیی نیشتمانی کوردستان و پەنجا کورسی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان * و پێنج کورسی بۆ ئاشورییەکانی کوردستان تەرخان کرابوو[1] .

پەرلەمان متمانەی بە حکومەتی هەرێمی کوردستان دا، بڕیار بوو چوار ساڵ جارێك هەڵبژاردنی بۆ ئەنجام بدرێت، بەڵام شەڕی ناوخۆی هەرێمی کوردستان ١٩٩٤-١٩٩٨ ڕێگر بوو لە بەردەم ئەم هەڵبژاردنە.

بەشێوەی دابەشبوونی کورسییەکانی پەرلەمان دەردەکەوێت، دروستکەری بڕیار لە هەرێمدا بە شێوەیەکی سەرەکی بە سەر ی.ن.ك و پ.د.ك دابەش بووە، هەر ئەم دابەشبوونە حکومەتی هەرێمو دەزگا کارگێڕییەکانی دەگرتەوە، لە ناو ئەم دوو پارتە سکرتێری گشتی جەلال تاڵەبانیو مەسعود بارزانی، بە بێ ئەوەی پۆستێکی کارگێڕیی یاساییان هەبێت، بەهێزترین دروستکەری بڕیاربوون لە هەرێمدا[2]، دەتوانین لە بۆچوونی ئەوانەوە جۆری ستراتیژی پەیوەندییەکانی هەرێم لەگەڵ تورکیا بزانین.

مەسعود مستەفا بارزانی[3] : لە بارەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیادا بەم شێوەیە باس دەکات: "سیاسەتی ئێمە لەپێشانو ئێستاش، بەرەو دامەزراندنی پەیوەندیی دۆستانەو هاوسێیەتی باشو ڕێزگرتنی یەکدیە لەگەڵ تورکیاو وڵاتانی دیکەی ئیقلیمی، ئەوە سیاسەتی ئێمەیەو بۆ ڕێزگرتنی سەروەری ئاسایشی تورکیاو وڵاتانی دیکەی ئیقلیمی ئامادەی هەر گرەنتیەکین، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئێمە خاوەن دۆزێکینو چەندان ساڵە لە پێناو مافەکانی گەلەکەمان تێدەکۆشین، هەروەها لە خەڵکی دیکەش چاوەڕوان دەکەین ڕێز لە مافو گەلەکەمان بگرێت"[4] .

---

* لێرە بەدواوەوە، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە ی.ن.ك ، پارتی دیموکراتی کوردستان بە پ.د.ك ، دەنووسرێت.

1 فرسەت ئەحمەد عەبدوڵڵاو ئەوانی تر: کوردستانی دیموکراتی سیاسەت، چاپی سییەم، چاپخانەی خەبات،ساڵی٢٦٩٩، ل/٥٦-٥٧.

2 مەریوان وریا قانع : دەسەڵاتو جیاوازی، چاپو ئۆفسێتی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلیمانی، ٢٠٠٠، ل/١١٤-١١٥.

3 لەساڵی١٩٤٦ لەدایکبووە سوودێکی زۆری لە رابردووی سەرکردایەتیی باوکی مستەفا بارزانی وەرگرتووە، کە لە ساڵی ١٩٤-١٩٧٥ سەرکردایەتیی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانی کردووە، لەساڵی ١٩٧٦ سەرکردایەتیی پ.د.ك. کردووە، هەڵبژاردنی رابەری بزوزتنەوەی رزگاریخوازی کورد رێژەی ٤٧,٥١٪ ی دەنگەکانی بەدەستهێنا، هەرچەندە هەڵبژاردنی رابەر لە وی یاساییەوە کاری پێنەکرا، بەڵام رێژەی دەنگەکان کەبەزۆری لەنێوان ئەو لەگەڵ جەلال تاڵەبانی دابەشبوو، هەریەکەیان ئەو افەی بەخۆی دابوو، بەناوی جەماوەری هەرێم، چ لەناوخۆو چ لەدەرەوەدا وتارو بڕیاربدات.

4 سەرۆك بارزانی: شەهید ئەو کەسەیە مەرگی خۆی هەڵبژارد بۆ ئەوەی ژیان بەخەڵکێکی تر بدات، پارتی دیمکراتی کوردستان، مەکتەبی ناوەندی ریکخستن، زنجیرەی ٥١ ، ٢٠٠٣، ل/٢٥.

جەلال حوسامەدین تالەبانی[1] : جیاوازی لەگەڵ مەسعود بارزانی لەوەدابوو سنووری چالاکی پارتەکەی لە تورکیاوە دوورتر بوو، بۆچوونی سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا بەم شێوەیە بوو: "ئێمە باوەڕمان وایە تورکیا دەوڵەتێکی گەورەیەو ناتوانین پشتگوێی بخەین، دەمانەوێت پەیوەندییەکی باش لەگەڵیدا ببەستین، بەڵام دووجۆر پەیوەندیی هەیە، پەیوەندییەکیان ئەوەیە لەگەڵ سوپای تورکیدا لە کوشتنی کوردی تورکیا بەشداری بکەین، ئەو پەیوەنییە رەتدەکەینەوە. ئەوی تریان ئەوەیە، مافی سروشتی خۆیانە سنوورەکانیان لەگەڵ ئێمەدا ئاسایشی تیادا پارێزراو بێت، ئەوە مافی تورکیاو ئەرکی سەرشانی ئێمەیە، وەك حکومەتی هەرێم سنووری دەوڵەتە دراوسێکان زامن بکەین، بەڵام بەو شێوەیەی کە ئێمە هەڵی دەبژێرین"[2] .

لەم دوو هەڵوێستەدا هەردوو سەرکردە، دان بە بایەخی پێگەی تورکیا لەبەرامبەر هەرێمی کوردستاندا دەنێن، هەمان کات هەردوولا خۆیان لە گۆشە نیگای تایبەتیی خۆیانەوە دەڕواننە پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو هەرێم. لەگەڵ ئەوەی دامودەزگای پەرلەمانی هەڵبژێردراوو حکومەت لە هەرێمی کوردستان بوونی تەواوەتیان هەبووە، بەڵام دەسەڵاتی کوردی لەلایەن تورکیاوە تەنها وەك سیفەتێکی کارگێڕی پارێزگاکان، داماڵراو لە هەموو چەمکێکی سیاسیی سەلمێنرا بوو، سەبارەت بە مامەڵەیان لەگەڵ سەرکردایەتیی کورد لە راگەیاندندا بە جۆرێك بوو، کە سەرەك ئەرکانی تورکیا لەساڵی ٢٠٠٥ وتی: "ئێمە تائێستا وەك سەرەك خێڵ روانیومانەتە سەرکردایەتیی کوردی"[3]، یان وەك بەرپرسێکی تر دەڵێت: "وەك سەرکردەی پارتێکی سیاسیی عێراقی مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین" [4] نووسەرێکی تورك بۆچوونی بۆ سەرکردەو دەسەڵاتی کوردی بەم شێوەیە: "ئاستەنگەکان لە سەرکردە کوردەکانەوە دەست پێدەکەن، کە ئارەزوویەکی بەهێزیان هەیە بۆ بەگەڕخستنی تواناکان لە پێناوی بەرژەوەندی حکومەتە خۆجێیەکانی نێوان خۆیان، نەك لە پێناوی دەوڵەتی سەربەخۆ، سەرکردەکان شەرعیەتیان لە سیستەمێکی سیاسیی وەرنەگرتووە، بەڵکو لە پێکهاتەی خێڵەکیی کۆمەڵایەتیی باو لەناوچەکە وەرگرتووە، جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی

---

1 لەساڵی ١٩٣٢ لەدایکبووە، لەساڵی ١٩٤٧ بۆتە ئەندامی پ.د.ك تاپلەی ئەندامی سەرکردایەتیی رۆیشتووە، ساڵی ١٩٧٥ پارتی ی.ن.ك دامەزراندووە، لەهەڵبژاردنی ڕابەری بزوزتنەوەی رزگاری خوازی کورد ڕێژەی ٤٤,٩٣٪ ی بەدەستهێنا. ڕێژەی ئەم دەنگانە بەهەمان شێوەی مەسعود بارزانی مافی نوێنەرایەتی جەماوەری کوردستانی بەخۆ دابوو.

2 فضائیتا mbc، ANN تحاوران مام جلال: الإتحاد الوطني الکردستاني، مکتب الإعلام المرکزي، سلیمانیة، ١٩٩٩، ل/٥.

3 MURAT Yet kin: OZKOK: we have to accept new different situation In Iraq Radical News 31 October 2005.

4 Saadet orus: Act like apolitical party [in Iraq ، Turkish Daily News 12 may 2001.

سەرکردەی هاوپەیمانیەتی خێڵەکی بە هۆی دارایی‌و هێز کاردەکەن، دامەزراوەی دەوڵەتی سەربەخۆ ئەم پێکهاتە کۆمەڵایەتیە بەخێرایی دەگۆڕێت‌و پەیوەندییەکان پێکدەهێنێت، باسکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی پێویستە دابەشبونی کۆمەڵایەتی‌و سیاسیی کوردی عێراق لە بەرچاو بگرێت، کە کاریگەرییەکی زیندووی سەرەکی لەسەر ئەنجامی کۆتایی هەیە"[1].

لەڕاستیدا پێگەی ستراتیجیی هەرێمەکە لەڕووی ناوچەییەوە بە تایبەت بۆ ئێران، هەروەها بایەخی بۆ ئەمریکا، تورکیای خستبووە سەربار کە پەیوەندییەکی هەمەلایەنەی سیاسیی، ئابووری‌و سەربازی لەگەڵ سەرکردایەتیی کورد ببەستێت.

## بنەمای سێیەم: پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوان

خاڵی هاوبەشی نێوان تورکیاو هەرێمی کوردستان بریتیە لەوەی هەردوولا لە پێکهاتەی دانیشتواندا هاوبەشن، تورکیا زۆرینەی تورك نەژادەو نەتەوەی دووەم کوردە، بەهەمان شێوە زۆرینەی دانیشتوانی هەرێم کوردن‌و کەمینەیەکی تورکمان لەگەڵیان دەژی، بۆیە لێرەدا باس لە کاریگەریی رەگەزی دەکەین لە سەر دەسەڵات‌و پەیوەندییەکان.

### یەکەم- کوردو دانیشتوانی تورکیا:

بەپێی ئاماری ۲۰۰۱، تورکیا ژمارەی دانیشتوانەکەی ٦٦,٤٩٣,٩٧٠ کەس بوو[2]، ئاماری ئەم دەوڵەتە رەچاوی پێکهاتەی نەتەوەیی نەکردووە، بەڵام سەرچاوە کوردییەکان ئاماژە بەوە دەکەن، لە ساڵی ۲۰۰۰دا، ۱۹ ملیۆن کورد لە تورکیا هەبووە، رێژەی ٥٤,٩١٪ ی دانیشتوانی کوردستانی گەورە پێکدەهێنن[3] بەم پێیە زۆرترین ژمارەی کورد لە ناو تورکیا دەژی کە رێژەکەیان زیاتر لە ۳۰٪ دەبێت، لەگەڵ بوونی ئەم ژمارە زۆرەی کورد لە تورکیا، خاوەنی کەمترین مافی نەتەوەیی نین، لە دەستووری ساڵی ۱۹۸۲ لە پێشەکیەکەیدا هاتووە "چەمکی سەروەری بۆ ئومەی تورکیە بە شێوەیەکی رەهاو بەبێ هیچ مەرجێك"، هەروەها نووسراوە: "هەموو ئەو کەسانەی پەیوەندییان بە رەگەزنامەی دەوڵەتەوە

---

1 Nihat a0zcan:excerpt:the kurdis in iraq, 2003, www.mepc.org\pubic _asp\journal\ indx.asp0

2 www.middle Eats Directory- country statistics. Turkey.

3 ئازاد محمد ئەمین نەقشبەندی: پرۆژەی گاب و کاریگەری لەسەر دەوڵەتی ناوچەکەو کوردستان، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ۲۰۰۳، ل/۱۰۸.

هەیە، تورکن"، لە مادەی ٢٤ هاتووە: "نابێت خوێندن لە دەزگا فێرخوازییەکان بە هیچ زمانێکی تر بێت، تەنها تورکی نەبێت، چونکە زمانی دایکە"[1] .

لەم دەستوورەدا برگەو مادەکانی زۆر روونو ئاشکران، کە تەنها تورك خاوەنی مافی نەتەوەییە، لە لایەکی دیکەشەوە ئەم دەستووره باس لەوە ئەکات، هەموو بۆچوونێك یاساغە گەر هەرەشە بێت بۆ یەکپارچەیی تورکیا. هەر ئەم دەقە لە یاسای تیۆری ١٩٩١، لە ماددەی/ ٨، دارێژراوەتەوە کە چەندین کەسی پێ دادگایی کراوە بە تۆمەتی بانگەشەکردن بۆ جوداخوازی، لەوانە، یەشار کەمال، گەورە نووسەری بە رەگەز کوردی تورکیا، هەروەها رۆژنامەنووسی بێگانەو تورك نەژادیشی گرتۆتەوە[2] .

کورد لە ناو تورکیا بۆ بەدەست هێنانی مافەکانی، چەندین رێگای جۆراوجۆری گرتووەتە بەر، لەوانە پێکهێنانی پارت بە شێوەی نهێنی کە گرنگترینیان لە راسترەوەوە تا دەگاتە چەپڕەو ئەمانەن :

پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا ١٩٦٥ دامەزراوە.

پارتی رزگاری ١٩٧٤.

کۆمەڵەی فەرهەنگیو دیموکراتی شۆرشگێڕ د.د. ك. د.، ١٩٧٤.

رێکخراوی مائویستی کاوە ١٩٧٦.

لایەنگرانی ئازادی نەتەوەیی کورد کوك، ١٩٧٧.

پارتی کرێکارانی کوردستان* پ.ك.ك، ١٩٧٨[3] .

پارتی ئیسلامی کوردستان ١٩٩٢.

لە لایەکی تریشەوە لە ژێر چەند ناوێکی خوازراو، چەند پارتێکی کوردی بە رواڵەت نیشتمانی تورکیو لە ناواخندا کوردی، بە شێوەیەکی یاسایی پێکهاتبوونو بەشداری هەڵبژاردنەکانیان دەکرد لەوانە:

پارتی کاری خەڵك HED ١٩٩٠ .

پارتی دیکراتی DP ١٩٩٣ .

---

1 المسألة الكردية في تركيا بعد انقلاب ١٩٨٠،منطقة الاكراد "كردستان" موضوعات سياسية www.almqatl.com

2 ميخايل م.جونتر: تقاليد السلطة المطلقة في تركيا، مجلة شؤون تركية ، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، ٢٠٠٤، ل/ ٢٥-٢٧.

*لێرە بەدواوە بە پ.ك.ك ناودەبرێت.

3 کریس کۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوەی کوردو هیوای سەربەخۆیی، بەرگی دووەم، وەرگێرانی لەفارسییەوە: ئەکرەمی میهرداد، سەنتەری چاپو پەخشی نما، ٢٠٠٢، ل/١٢٨—١٥٠.

پارتی کاری دیموکراتی خەلك HEDP ١٩٩٤[1].

خەباتی نەتەوایەتی کوردی باکووری کوردستان، وەك نوێنەری پێشووی فەرەنسا لە تورکیا ئەریك رۆلۆ دەڵێت: کاتێك کۆتایی دێت بە یاسایی ناسنامەی کورد بناسرێت، مافە سیاسییو رۆشنبیرییەکانیان بێتەدیو بنەما دیموکراتییەکان بۆ دانیشتوانی تورکیا بە یەکسانی جێبەجێ بکرێت[2]، بەڵام تورکیا چارەسەری بۆ کێشەی کورد یەکلایەنەو لە ژێر بیرکردنەوەی تەواو تورکیدا بوو، کە لەم خاڵانەی خوارەوە بەرجەستەبوو بوو:

١. هەوڵدان بۆ تواندنەوەی کورد لە ناو کۆمەڵی تورکی بە جۆرێك کە دەستبەرداری مافی نەتەوایەتی خۆی ببێتو هاووڵاتییەکی دڵسۆز بێت بۆ دەوڵەتی تورکیا.

٢. وەڵامدانەوەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی، چەکدار بێت یان بێ چەك، بە توندترین شێوازی سەربازیو بەکارهێنانی چەمکی تیرۆر لە بەرامبەریدا.

٣. چارەسەرکردنی کێشەکانی باکووری کوردستان لە رێگەی پرۆژەی ئابووریو بەستنەوەی کێشەی نەتەوەیی کورد بە دواکەوتوویی ئابووری ناوچەکەوە[3].

سلیمان دیمیریل سەرۆك کۆماری تورکیا لە ساڵی١٩٩٣ دەڵێت: "کورد لە مافی کەم نییە، ئەوەی ئەوان داوای دەکەن ئیمتیازە، ئێمەش ئیمتیاز بە کەس نادەین، من تورکیا دابەش ناکەم"، "ئێمە کێشەی کوردمان نییە، بەڵکو کێشەی تیرۆرمان هەیە، فێربوونی زمانی کوردی دەبێتە هۆی دابەشکردن، تا کێشەی تیرۆر چارەسەر نەکەین ناتوانین کێشە رۆشنبیرییەکان چارەسەر بکەین"[4].

بارودۆخی نوێی هەرێمی کوردستان لە دوای ساڵی ١٩٩١ بە شێوەیەکی راستەوخۆ کاریگەری لە سەر باکووری کوردستان هەبوو، چونکە لە ساتەوەختی هەنگاونانی هەرێم کورد بەرەو سەربەخۆیو مافی چارەنوسو دەوڵەتداری، هاورێ لەگەڵیدا خۆپیشاندانی کورد لە تورکیا فراوان بوو، بە تایبەتی لە کاتی نزیکبوونەوەی ساڵانەی جەژنی نەورۆز لە مانگی مارت زیاتر پەرەی سەند، لەلایەکی تریشەوە هەرێمی کوردستان بوو بە بنکەیەکی لەبار بۆ ئۆقرەگرتنی پارتەکانی باکووری کوردستان، بۆ نموونە پارتی دیموکراتی کوردستان، هەڤگرتن لە ٢-٩/سێپتەمبەر/١٩٩٢و بە بەشداری ١٢٠ ئەندام کۆنگرەی خۆیان، لە شارۆچکەی سەرسەنگی سەر بە پارێزگای دهۆك بەست، هەروەها پارتی د.د.ك.د و کوك ئەندامانی

---

1 سەرچاوەی پێشوو، ل/١٧٩-١٨٢.

2 أريك رولو: التحديات التى تواجه تركيا، مجلة ڕوانگەی جيهان ، عدد/٤ ، ١٩٩٥، ل/١١٤.

3 فليب روبنس: تركيا والشرق الأوسط، ترجمة: ميخائيل نجم خوري، مكتبة مدبولى، قاهرة، ١٩٩٣، ل/٤٤.

4 المسألة الكردية في تركية الأمل والخيبات، مجلة شون تركية مركز الدراسات الإستراتيجية والبحوث والتوثيق، عدد/٨، ل/٣٠.

کاوەو بزووتنەوە سۆسیالیستییەکانو چەند کەسانێکی سەربەخۆ لە کۆنگرەیەکدا لە ٢١-٢٧/سێپتەمبەر/١٩٩٦ پارتی یەکێتیی سۆسیالستی کوردستانPYSK یان پێکهێنا[1] لە هەمان کاتدا چالاکییە چەکداریو رێکخراوەکانی پ.ك.ك لە هەرێمدا بەهێزترین هۆکار بوو بۆ مانەوەو بەردەوامبوونیان لە دژی تورکیا.

چالاکبوونی بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە باکووری کوردستان لە ژێر تینوتاوی هەرێم لای سەرکردە سیاسییەکانی تورك چاوەڕوان کراوو مەترسیدار بوو، وتەکانی ئەو سەرکردانەی تورك لە کاتی راگەیاندنی فیدرالّیدا لە سالّی١٩٩٢ رێژەی ئەو سلّەمینەوەیەو کاریگەری لەسەر کوردو دەولّەتی تورکیا دەردەخات، سلیمان دمیریل وەك سەرەك وەزیرانی ئەو کات وتی: "ئەگەر دەولّەتێکی فیدرالّی کوردی راگەیەندرا، ئەوا نەك تەنها داوای خاکی تورکیا، بەلّکو داوا لە سوریاو ئێرانیش دەکەن". هەروەها بولّنت ئەجەڤیت، دەلّێت: "ئەوەی بە دوای ئەو فیدرالّیەدا دێت دابڕینی بەشێك لە زەوی تورکیایە"[2].

دەسەلاّتی هەرێمی کوردستان بە هیچ جۆرێك سیاسەتی بەکارهێنانی کوردی باکووری کوردستانی وەك کارتێکی فشار لە دژی تورکیا نەبوو، بۆ نموونە جەلال تالّەبانی پێی وابوو، نابێت تورکیا پارچە پارچە بکرێت، کورد پێویستە بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە لە ناو تورکیا خەبات بۆ چەسپاندنی مافە نەتەوەییەکانو بنەما دیموکراسییەکان بکەن، چونکە شەڕی نێوان بزووتنەوەی کوردو سوپای تورکیا، زیانێکی گەورە بە هەردوولا دەگەیەنێت[3] بەلاّم تورکیا تورکمانی وەك یەکێك لە کارتەکانی فشار بۆ سەر هەرێمی کوردستان بەکار دەهێنا.

**دووەم- تورکمانو دانیشتوانی هەرێمی کوردستان:**

بەپێی ئاماری سالّی١٩٩٩ رێکخراوی مەلّبەندی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ نیشتەجێکردنی مرۆیی Habitat، ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان ٣,٥١٥,٩٢١ کەس بوون. زۆرینەی پێکهاتەی نەتەوەی دانیشتوانی کوردە، بە جۆرێك بەپێی ئاماری

---

1 کریس کوچیدا، بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد ، بەرگی دووەم، ل/١٨٦.

2 مجلة شؤون ترکیة ، ترکیا وإعلان الدولة الکردیة في شمال العراق، النفط مقابل الاعتراف، مرکز الدراسات الإستراتیجیة والبحوث والتوثیق، عدد/ ٢، ١٩٩٢، ل/ ٣-٤ .

3 مام جلال: شەڕی پارتیو پەکەکە شەڕی پارتیە لەگەل کوردستانا باکوور، گوڤارە سەرهەلّدان ، ژمارە/١٩٩٥،١٥، ل/١٧.

۱۹۸۷ی حکومەتی عێراقی، ڕێژەی کورد لە پارێزگای دهۆك ۸۳,۳ ٪، هەولێر ۷۸,۸٪ و سلێمانی نزیکەی ۱۰۰٪ پێك دەهێنێت[1].

تورکمان لەم هەرێمەدا تەنها لە ناو شارەکاندا دەژین، بەپێی ئاماری ۱۹۷۷ لە قەزای دهۆك ڕێژەی ۰,۳٪، هەولێر ۳,۲٪، زاخۆ ۰,۲٪، ئامێدی ۰,۱٪، شەقلاوە ۰,۱٪ ڕەواندوز ۰,۲٪، کفری ۵,۲ ٪[2].

ئەگەرچی لە ئاماری عێراقیدا تورکمان سەرژمێری کراوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك لە ناو دەستوور خاوەن مافی نەتەوەیی نەبوونو بەردەوام بە شێوازی جۆراوجۆر هەوڵ دراوە کە لە ئامارەکاندا ڕێژەیان کەم بکرێتەوە[3]. ڕۆڵیان وەك نەتەوەیەکی تایبەتمەند لە عێراقدا نەهێڵدرێت[4] بۆ بەرگرتن لە دەست تێوەردانی تورکیا لە کاروباری عێراق.

تورکمان لە عێراقدا بۆ بەدەستهێنانی مافی نەتەوایەتی چەند پارتێکی نهێنیان پێکهێناوە، بەڵام لە لایەن حکومەتی عێراقیەوە زۆر بەتوندی بەرپەرچیان دراوەتەوە، بەتایبەتی لە ساڵانی ۱۹۵۸–۱۹۹۰ لە دوای ساڵی ۱۹۹۱و پەیدابوونی هەرێمی کوردستان، تورکمان لەم سنوورەدا سوودێکی زۆریان بینیو بە ئاشکرا چەندین پارتیان پێکهێنا کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:

پارتی یەکێتییو برایەتیی تورکمان ۱۹۹٤

پارتی یەکبوونی تورکی تورکمان بیرلیك پارتسی

پارتی یەکێتیی تورکمان تورکمان أیلی ۱۹۹٤

بزووتنەوەی سەربەخۆیی تورکمان ۱۹۹٥

بەرەی تورکمان۱۹۹۷[5].

پارتە تورکمانەکان بانگەشەی نەخشەیەکی نەتەوەییان دەکرد،کە لە نیوە زیاتری باشووری کوردستانی دەبردو ناوەندی شاری موسڵو هەولێرو کەرکوکی دەگرتەوە[6] هاوکات بە هیچ جۆرێك دانیان بە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا نەدەناو هەرێمەکەیان بە ناوی باکووری

---

1 خليل إسماعيل محمد: إقليم كوردستان العراق، دراسات في التكوين القومي للسكان، مطبعة أوفسيت كريستال، أربيل ۱۹۹۸، ل/۵۸.

2 هەمان سەرچاوە، ل/۷۸.

3 خليل إسماعيل محمد، ل/۷۷.

4 عزيز قادر الصامانجي: التأريخ السياسي لتركمان العراق، دار الساقي، ۱۹۹۹، ل/۲۰۳.

5 عزيز قادر الصامانجي: التأريخ السياسي لتركمان العراق، ل/۲۲۲-۲۲۹.

6 سەرچاوەی پێشوو ، ل/۳.

عێراق ناو دەبرد[1]، هەروەها هیچ کاتێك ئەو هەستە نەتەوەییەیان نەدەشاردەوە، کە تورکمان‌و باشووری کوردستانیان وەك بەشێك لە تورکیا دەزانی کە لە ساڵی١٩٢٦ بەزۆر لێی دابڕاوە[2] .

بە واتایەکی تر تورکمان هەمیشە خۆیان بە تورك‌و شوێنی نیشتەجێبوونیان بە تورکیا دەزانی، لەبەرامبەر هەموو ئەمانەدا حکومەتی هەرێمی کوردستان رێگەی پێدابوون بە ئازادی کاری سیاسیی خۆیان بکەن‌و خاوەنی رۆژنامەو کەناڵی تەلەفزیۆنی‌و ئیزگە بن، هەروەها قوتابخانەی تایبەتییان بە زمانی تورکی‌و بە پیتی لاتینی هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەو ماف‌و ئازادییە نەتەوەییە، تورکیا هەوڵی دەدا رۆڵێکی گرنگ بۆ تورکمان لە هەرێمی کوردستان مسۆگەر بکات، بە مەبەستی لە نزیکەوە بەشداریکردن لە گۆڕانکارییە سیاسییەکانی عێراقدا.

بەڵام رێژەی کەمی دانیشتوانی تورکمان‌و نەبوونی سنووری نەتەوەیی هاوبەش لەگەڵ تورکیا لە گرنگترین لەمپەرەکانی بەردەم ئەم هەوڵە بوون[3] .

## بنەمای چوارەم: بنەما سەربازییەکان

بۆ باسکردنی ئەم باسە پێویستە لەسەر دوو خاڵ هەڵوێستە بکەین، دامودەزگاکانی سوپا لە تورکیا، لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان.

**یەکەم-دامودەزگای سوپا لە تورکیا:**

سوپا بەشێکی سەرەکی دروستکردنی بڕیاری سیاسییە لە تورکیا، کودەتا سەربازییەکانی سالآنی ١٩٦٠،١٩٧١،١٩٨٠، ئەو راستییە دەسەلمێنن. ئەم رۆڵە بنەمایەکی کەلتووری هەیەو بە مێژووی تورکیادا رۆچووە، چونکە دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتای دروستبوونی تا رووخانی ١٩٢٣، لەسەر بنەمایەکی سەربازی بەند بوو، هەروەها کۆماری تورکیای نوێ لە ساڵی ١٩٢٣ لەسەر دەستی ئەفسەرەکان دامەزرا بوو، لەم روانگەیەوە سوپاو ئەفسەرو سەرباز لە تورکیا، جیاواز لە کۆمەڵگەی جیهانی، چینێك بوون وەك چینی جوتیارو کرێکارو بۆرجواز[4] .

---

1 سەرچاوەی پێشوو ، ل/٢٢٥-٢٣٢.

2 سەرچاوەی پێشوو، ل/٢٣٤.

3فرید أسسرد: رهان خاسر علی الترکمان، مجلة شؤون ترکیة، مرکز أربیل لدراسات الإستراتیجیة، سلیمانیة، عدد/١، ١٩٩٨، ل/٩.

4أندرو فنکل وآخرون: ترکیا المجتمع والدولة، ترجمة: حمدي حمید الدوری و زمیله، بیت الحکمة، بغداد ٢٠٠٠، تورکیا، ل/٦٨-٦٩.

سوپا بەپێی مادەی ٣٥، لە دەستووری ١٩٨٢، پارێزگاریو پاراستنی دەوڵەتو ئاسایشی نیشتمانی تورکیای لە ئەستۆدا بوو، لە ناوخۆدا لە پارێزگاریکردنی عەلمانیەتو دابەشبوونی تورکیاشدا خۆی دەبینیەوە، لە دژی رەوتی ئیسلامیو کیشەی کورد، هەروەها لە دەرەوەی تورکیاشدا یەکیك لە ئەرکەکانی سوپا چاودێریکردنی کێشەی کورد بوو لە عێراقو ئێرانو سوریا جگە لە کێشەکانی تری وەك قوبرسو یۆنانو بەلقان[1] .

ئەمە وایکردبوو سوپا لە تورکیا ئەرکێکی زۆری لە ئەستۆدا بێت، بۆیە خاوەنی چەكو پێداویستیی ئەوتۆیە لە ریزی سوپای ناتۆدا ریزبەندی چوارەمە[2]. بەڵام گەورەترین ئەرکی دەوڵەت بریتی بوو لە بەرەنگاربونەوەی پ.ك.ك. لە ناوخۆدا، کە هەرەشەیە لە سەر یەکپارچەیی خاکی تورکیا، هاوکات رووبەڕوو بوونەوەی کێشەی کورد لە ناو هەرێمی کوردستان.

**دووەم- پارتی کرێکارانی کوردستان**

ئـەم پارتـە بـە شـێوە زاری کرمـانجی بـە Partiya Kareem Kurdistan نـاو دەبرێـتو کورتکراوەکەی پ.ك.ك، P K K، لە ٢٧/ نۆڤەمبەر/١٩٧٨و لە دێی فیس سـەر بـە قـەزای لیجە لە پارێزگای دیاربکر بە سەرکردایەتیی عەبدوڵڵا ئوج ئالان[3] دامەزرێنرا[4] .

ئامانجی ئەم پارتە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی بوو لە سنووری کوردستانی گەورەدا، بۆ بەدیهێنانی یەکسانیی کۆمەڵایەتیو ئابووری لە کۆمەڵگای کوردی خەباتی دەکرد[5]، بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە خەباتی چەکداری تاکاری توندوتیژی لە دژی دەوڵەتی تورکیا وەك گەورەترین داگیرکەری کوردستان پراکتیزە کردووە[6] . رەنگدانەوەی بیری کۆمۆنیستی لە ناو بەرنامەی پ.ك.ك رەنگی دابۆوەو دژایەتی بۆ ئیمپریالیزمی رۆژئاواو

---

1 عبد الوهاب القصاب، دور المؤسسة العسكرية التركية في صياغة مدركة الأمن القومي التركي، مجلة دراسات سياسية ، عدد ١٩٩٩، ل/٥٤-٥٥.

2 بروانە خشتەی ژمارە/١ .

3 عەبدوڵڵا ئوج ئالان لەدایکبووی ١٩٤٩ یەو بە ئاپۆ ناسراوە، دەرچووی کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرەیە، بیروباوەڕەکانی مارکسی رادیکاڵی شۆڕشگێڕانەبوون.

4 P.K.K. عشرون عاماً، إعداد، محمد نور الدين، مجلة شؤون تركية ، عدد/ ٨ ، ١٩٩٣، ل/٣٦

5Henri J. Barky and his friend: Turkeys Kurdish Question.23-24.

6 کریس کۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، بەرگی دووەم، ل/١٥١.

کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی کوردستان دەردەبڕی، بە شێوەیەك عەبدوڵڵا ئوج ئالان خواستی ئەوەی هەبوو شۆڕشی ئۆکتۆبەر *ی روسیا لە کوردستان دووبارە بکاتەوە[1] .

عەبدوڵڵا ئوج ئالان و هاوڕێکانی لە ساڵی ١٩٧٩ تورکیایان بەجێ هێشتو لە دەشتی البقاع لە نێوان لوبنانو سوریادا نیشتەجێ بوونو یەکەم شوێنو سەربازگەی راهێنانیان لەو شوێنە دامەزراند، ساڵی ١٩٨٤، یەکەم چالاکی پارتیزانی گەریلا یان لە پارێزگای سەعرەت بەئەنجام گەیاندووە. لە ساڵی ١٩٨٦ سوپای رزگاری گەلی کوردستانARGK، وەك باڵی سەربازی ناو پارتەکە دامەزرێنرا[2] .

گەورەترین خۆپیشاندانی پ.ك.ك لە ١٥ی مارتی١٩٩٠ لە ئەنجامی بە خاکسپاردنی تەرمی گەریلایەك لە شاری نەسیبەین، رویدا، لە ئاهەنگی جەژنی نەورۆز ٢١ی مارت، بەتینتر بوو. ئەم رووداوە لە راگەیاندن بە راپەرین إنتفاضة، وەك هاوشێوەی راپەڕینی فەلەستینییەکان دژی ئیسرائیل ناوبرا[3] . قەوارەو هێزی پ.ك.ك، لە راپۆرتێکی بەردەست سەرەك کۆمار بەم جۆرە دیاری کرا بوو، بە ١٠ هەزار چەکداری شەڕکەر لە چیا، ٦٠ هەزار شەڕکەر لە دێهاتو ٣٧٥ هەزار کەسی ریکخراو لە ناو تورکیا[4] . هەروەها بە پێی وتەی وەزیری دەوڵەت ساڵح یەلدرم، ئەنجامی زیانەکانی شەڕی تورکیا لەگەڵ پ.ك.ك لە نێوان ساڵانی١٩٨٤-١٩٩٨ بەم جۆرە بوو، ٢٧هەزار کوژراو کە ١٠هەزاری لە ریزی سوپا بووە، ٣هەزار دێی سووتاوە، ٨٤ ملیاردۆلار لەلایەن دەوڵەتەوە لەم شەڕە خەرج کراوە[5] . بەپێی راپۆرتی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا، تێچونی شەڕکردنی لەگەڵ پ.ك.ك ساڵانە بڕی ١٠

---

*شۆڕشی ئۆکتۆبەری بریتیە لە شۆڕشێکی کۆمۆنیستی بەرابەرایەتی لینین لە روسیا ساڵی ١٩١٧دا رویداوە، بەرئەنجامەکەی پێکهێنانی دەوڵەتێك بوو لەسەر سیستەمی کۆمۆنیستی، دواتر بە یەکێتی سۆڤیەت ناسرا، لەساڵی ١٩٩١ کۆتایی بەحوکمرانی ئەو شێوە سیستەمە هات.

1 المسألة الكردية في تركية، مأزق حزب العمال الكردستانى، منطقة الاكراد "كردستان" موضوعات سياسية، www.Almqatl.com

2 PKK عشرون عاماً، إعداد، محمد نور الدين، مجلة شؤون تركية ، عدد/ ٨ ، ١٩٩٣، ل/٣٦-٣٧

3 کۆنتر بیرنر: بزاڤا نەتەوایەتیا باکووری ل/تورکیا، وەرگێڕان لەئەڵمانیەوە: حازمی جاسم، گۆڤاری هەڤیبون ، ژمارە/٢-٣، ١٩٩٨، ل/ ١١٢-١١٣ .

4 أريك رولو: التحديات التى تواجه تركيا، مجلة ڕوانگەی جیهان ، عدد/ ٤ ، ١٩٩٥، ل/١١٢-١١٣.

5 Vmichel verrier: A trvmp card for s Turkey kurish guerrillas: .1997-2006 Le Monde diplomatique www.mondediplo.com.

ملیار دۆلار بووه، تەنها لەساڵی١٩٩٤ کەرتی گەشتوگوزار بە هۆی هێرشەکانی پ.ك.ك، ٧٠٠ملیۆن دۆلار زیانی لێکەوتووە[١] .

پێگەی هەرێمی کوردستان لەم شەڕەدا زۆر گرنگ بوو، چونکە ئەو جێگەیە بوو کە سوپای تورکیا لەگەڵ گەریلای پ.ك.ك، ڕووبەڕووی یەك دەبوونەوە، سوپای تورکیا لە ساڵانی ١٩٩٢-١٩٩٨، بە شێوەی جۆراوجۆر، ٣١٣ جار سنووری خاکی هەرێمی کوردستانی بەزاند، ٥٠ چالاکی زەمینی، ٢٢٥ چالاکی فڕۆکەوانی، ٣٨ جار بۆمبابارانی هەرێمەکەی کردووە[٢] . هەمیشە لە ڕاگەیاندندا ئامانجی چالاکییە سەربازییەکان بە پاراستنی ئاسایشی نەتەوەی لە هەڕەشە تیرۆریستیەکانی پ.ك.ك لە قەڵەم دراوەو نکۆڵی لە پێشێلکردنی سنووری نێودەوڵەتیی نێوان تورکیاو هەرێمی کوردستان دەکرا، بەردەوام ماوەی مانەوەیان بە کاتی وەسف دەکرد[٣]. بەڵام بە دیوێکی تر لەپشت هەموو کشانێکی سوپای تورکیا بۆ هەرێم مەبەستی تری لەپشتەوە بوو، وەك جەلال تالەبانی لەساڵی ١٩٩٧ دا لە نامەیەك بۆ سەرەك وەزیرانی فەرەنسای ناردووە: "بۆ لەناوبردنی ئەزمونی دیموکراتی گەلەکەمانە کە پێش دەست تێوەردانی تورکی بەشێوەیەکی سەرکەوتوو بونیات نراوە"[٤] هەروەها لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا، ئامانجی سوپای تورکی بەم شێوەیە دیاری کردووە:

- بەرگرتن لەنفوزی ئێران لە ناوچەکە .
- بەهێزکردنی نفوزی تورکیا لە هەرێم.
- کاریگەریی تورکیا لە گۆڕانکارییەکانی ناو عێراق .
- لە پێناوی بەرگرتن لە دروستبوونی دەوڵەتی کوردی[٥] .

مەبەستو ئامانجەکان هەرچی بووبن، گرنگ ئەوەبوو سوپا بەردەوام سنووری هەرێمی پێشێل دەکرد، لە ڕاستیدا ئەوەی ئەم بیانوانەی دەست تورکیا خستبوو، ئەو هۆکارە بوو کە پ.ك.ك پاراستنی هەرێمەکەی لەلایەن هاوپەیمانانەوە بە هەوڵی ئیمپریالیزمی لە قەڵەمدەدا دانیان بە حکومەتی هەرێمو دەسەڵاتی ی.ن.ك و پ.د.ك دا نەدەنا[٦]. لە ساڵی ١٩٩٥ دا لە

---

1 The Workers' Party of Kurdistan PKK Ministry of Foreign Affairs - Turkey .C:\MFA - IV_ Targets and Activities.htm.

2 یوسف إبراهیم الجهمانی: أوج ألان، ترکیا والاکراد، دار حوران، دمشق، ل٧٦.

3 المسألة الکردیة فی ترکیة بعد إنقلاب١٩٨٠، منطقة الاکراد "کردستان" موضوعات سیاسیة: www.Almqatl.com

4 یەکیەتی نیشتمانیی کوردستان سکرتێری گشتی ٢٠/١١/١٩٩٧.

5 فضائیتا MBC، ANN تحاوران مام جلال، ل/٢٠.

6 حزب الحریة الکردستانی: ضرورة موضوعیة تاریخیة مجلة دەنگی کوردستان ، عدد خاص، ١٩٩١، ل/٥٢-٥٣.

سنووری نێوان تورکیاو هەرێم، فدراسیۆنی بادینانو بۆتان یان و وەك حكومەتێكی شەرعی لەو ناوچانەی كە لە ژێردەستیان بوون، راگەیاند[1] .

عەبدوڵڵا ئوج ئالان لە ناو پ.ك.ك، خۆی بە سەركردایەتییو مەكتەب سیاسییو سەرۆك دەزانی[2]، ی.ن.ك و پ.د.ك ی وەك دوو هێزی خێڵەكیو دەرەبەگیو زۆرجار خیانەتكار دادەنا، پێیوابوو "یەكێتییو پارتی لە سەر هێڵی ئەنقەرەو واشنتن پەروەردە كراونو ئامادە كراون"[3] . هەر لەم سۆنگەیەوە پ.ك.ك هەردەم پەیوەندیی نێوان هەرێمی كوردستانو توركیای بە پلانێك لە دژی خۆی دادەنا. هەموو ئەمانە ئەوە دەردەخەن،

پ.ك.ك لە بەرامبەر هەرێمی كوردستان لە ململانێدا بووەو وەك ركابەری خۆی مامەڵەی لەگەڵدا كردووە، بەتایبەت بارودۆخی تازە دامەزراوی حكومەتی هەرێم لە دۆخێكدا بوو كە لە یەك كاتدا توانای بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ بەغداو پ.ك.ك نەبوو، توركیا لاوازیی هەرێمی قۆستەوەوەو، هەوڵەكانی لە پێناوی پەیداكردنی هاوپەیمانێكی كوردی بوو لە دژی دوژمنێكی كوردی وەك پ.ك.ك، سەلماندنی ئەم بۆچوونە لە وتەی سەرەك ئەركانی سوپای توركیا دۆغان گۆریش دەردەكەوێت، لە میانەی یەكەم ئۆپەراسیۆنی سوپای توركی لە ساڵی ١٩٩٢: "ئاسایشی ئێمە بە پلەی یەكەم گرنگە، لەبەر ئەمە پێشمەرگە، بە تەنها دەتوانێت ئەم كارە بكات؟ ئێمە لەپێشەوە وتوومانە با ئەو زۆنگاوە پاك بكەینەوە"[4]

---

1 د. رزگار: pkk تواصل الحرب بحق كورد العراق، مجلة متين ، ل/٧٧.

2 يوسف ابراهيم الجهماى: أوج الآن، ل/٦٥.

3 عەبدوڵڵا ئوج ئالان : لەدەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانی دیموكراسیانە، وەرگێڕانی: لوقمان عبداللە، بەرگی دووەم، چاپی دووەم، چاپخانەی رەنج، سلیمانی، ٢٠٠٤، ل/٢٣٩.

4 جيف سيموند: عراق المستقبل، السياسة الامريكية فى إعادة تشكيل الشرق الاوسط، دار الصافى، بيروت، ٢٠٠٤، ل/١٨٤.

## خشتەی ژمارە یەك

## هێزی سەربازی تورکیا

| رەگەزەکانی هێز | قەوارەی هێز |
|---|---|
| هێزی نیزامی | ٦٩٣,٠٠٠ سەرباز |
| هێزی یەدەك | ٣٧٨,٧٠٠ سەرباز |
| هێزی شێوە سەربازی | ١٨٢,٢٠٠ سەرباز |
| هێزی پەیمانی ناتۆ | ٣٢٣٠ سەرباز |
| هێزی وشکانی | ٥٢٥,٠٠٠ سەرباز |
| تانکە جەنگیە سەرەکیەکان | ٤٢٠٥ تانك |
| زریێ پۆش | ٢٥٢٩ دانە |
| تۆپ | ٤٢٧٤ پارچە |
| هێزی ئاسمانی | ٦٣,٠٠٠ سەرباز |
| فرۆکەی جەنگی | ٤٤٠ فرۆکە |
| هەلیکۆپتەری جەنگی | ٣٧ هەلیکۆپتەر |
| موشەکی دژە ئاسمانی | ٣ شێوە |
| هێزی دەریایی | ٥١,٠٠٠ سەرباز |
| ژێردەریایی | ١٦ ژێردەریایی |
| مدمرات | ٢ |
| فرقاطة | ١٩ |
| بەلەمی جەنگی | ٥٠ دانە |
| چەکدارکردنی هێزەکانی ناتۆ | چەکدارکردنێکی تایبەت |
| موشەکی ئەرز ئەرز | نییەتی |
| چەکی کاولکار | نییەتی |

## بنەمای پێنجەم: ئابووری

ئابووری هەردەوڵەتێك كۆمەڵێك خەسڵەتی خۆی هەیە، یەكێكە لە پێوەری تواناو بەهێزی ئەو دەوڵەتە كار دەكاتە سەر شێوازی پەیوەندییەكانی لە دەرەوەدا[١]. توركیاو هەرێمی كوردستان لە ڕێگەی ئەو خەسڵەتە ئابوورییانەی خۆیانەوە، پەیوەندییەكی بەتین بەم شێوەیەی لای خوارەوە بەیەكەوەی گرێدابوون.

**یەكەم- توركیا:**

یەكێكە لەو ٣٥ دەوڵەتەی جیهان كە خاوەنی داهاتێكی مامناوەندە، ئەندامی ڕێكخراوی ئابووریو گەشەپێدانی ئەوروپایە OECD، خاوەنی ئابوورییەكی كشتوكاڵیو پیشەسازییە[٢]. ڕێژەی گەشەكردنی بەرهەمهێنانی نەتەوەیی بەردەوام لە بەرزبونەوە دایە بە جۆرێك لە ساڵی ١٩٨١ ڕێژەی ٥,٣% بووە، لە ساڵی ١٩٩٠دا زیادیكردووە بۆ ٩,٧%[٣]، بە تایبەت لە سایەی سیاسەتی ئابووری بازاڕی ئازاد كە توركۆت ئۆزال پیادەی دەكرد، لە ڕێگەی كەم كردنەوەی باجی گومرگی، دەستێوەردانی دەوڵەتی لە كاروباری ئابووری بۆ ئاستێكی نزم دابەزاند، لە ئەنجامدا بەرهەمهێنانو هاوردەی توركیا بە شێوەیەكی بەرچاو زیادی كرد[٤].

توركیا چەند كێشەیەكی گەورەی ئابووری درێژخایەنی هەبوو، لەوانە كێشەی هەڵئاوسان، لە ساڵی ٢٠٠٠ گەیشتبووە ٣٩%، هەروەها قەرزی دەرەكی، بۆ هەمان ساڵ گەیشتبووە ١٠٩ ملیار دۆلار،[٥] بێكاری وەك كێشەیەكی تر لە ١٩٩٥ ڕێژەكەی گەیشتبووە ١٠%[٦] و دابەزینی بەردەوامی نرخی لیرەی توركی، بە جۆرێك لە ساڵی١٩٨٠ یەك دۆلاری ئەمەریكایی ٧٦,٠٣٦ لیرە بووە، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٠ گەیشتۆتە ٢٦٠,٧٢٤ لیرە[٧].

ئابووریی توركیا لە نەوەدەكان بەهۆی دووەمین جەنگی كەنداوەوە بەرەو ڕووی زیانێكی گەورە بووەوە، لە ساڵی ١٩٩٠-١٩٩٨ بڕی ٩ ملیار دۆلار زەرەرمەند بووە[٨]، چونكە

---

1 سعد حقي توفيق: مبادیء العلاقات الدولية، دار وائل، عمان ٢٠٠٠، ص/١٥٩-١٦٠.

2 إبراهيم خليل احمد واخرون: تركيا المعاصرة، ل/١١٥.

3 عبد الزهرة شلش العتابي: توجهات توركيا نحو اقطار الخليج العربي، دار الشؤن الثقافية العامة، بغداد ٢٠٠٢، ل/١١١.

4 اندرو فنكل : تركيا المجتمع والدولة، ل/٢٧٠-٢٧١.

5www.middle Eats Directory- country statistics; Turkey

6 احمد خليل الضبع: الأقتصاد التركي مسيرة محفوفة بالمخاطر، مجلة السياسة الدولية ، القاهرة، عدد/١٣١، ١٩٩٨، ل/٢٠٤.

7 ابراهيم خليل احمد واخرون: تركيا المعاصرة، ل/ ١٢١"

WWW.Middle Eats Directory- country statistics. Turkey.

8Amikam Nachmani: Turkey in the wake of the Gulf war Recent History and its implication، 1999.faind articles.com

زۆرترین شمەکی هاوردەی تورکیا نەوت بووە، کە سەرچاوە سەرەکیەکەی عێراق بوو، ئەمە جگە لەو سوودەی لە کرێی گواستنەوەی نەوتی عێراق بۆ بازارەکانی جیهان دەستی کەوتووە، ساڵی ١٩٨٥ بڕی نەوتی عێراقی کە بەخاکی تورکیا گەیشتوەتە بەندەرەکانی جیهان و یومورتالیك رۆژانە گەیشتووەتە ٦٠٠ هەزار بەرمیل کە بۆ هەر بەرمیلێك ٣٥ سەنتی ئەمریکایی وەك کرێی گواستنەوە وەرگرتووە، لەگەڵ ئەوەدا ئەو مافەشی پێدرا بوو ٤٠٪ ئەو نەوتە بەپێی نرخی رۆژانە، بۆ پێداویستیە ناوخۆییەکان بەکار بهێنێت [1] .

پەیوەندیی ئابووری نێوان عێراقو تورکیا بەهۆی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان کۆتایی هات، چونکە لە ئەنجامی لەشکرکێشیی سوپای عێراق لە ٢/ئۆگستۆس/١٩٩٠ بۆ سەر کوەیت، بڕیاری٦٦١ لە ٦/ئۆگستۆس دەرکرا، کە هەموو مامەڵەیەکی دارایی‌و بازرگانی نێودەوڵەتیی لەگەڵ عێراق قەدەغە کرد، لە رێکەوتی ٢٥/هەمان مانگدا، بە پێی بڕیاری ٦٦٩ گەمارۆی ئابووری خرایەسەر عێراق [2] تورکیا لای خۆیەوە لە ٧/ئۆگستۆس/١٩٩١، وەك پابەندبوون بە بڕیاری نەتەوە یەکگرتوەکان، هێڵی نەوتی عێراق-تورکیا ی داخست [3] دواتریش پابەندیی خۆی بەبڕیاری ٦٦٩ دەربڕی. سەرەنجام رێژەی هاوردەی شمەك‌و کاڵای عێراق بۆ تورکیا دابەزی بە جۆرێك لە ساڵی ١٩٨٩دا ١٠,٤٪ بووە، ئەم رێژەیە لە ساڵانی ١٩٩٠-١٩٩٢ بۆ ٠٪ دابەزیوە [4] .

## دووەم- هەرێمی کوردستان:

دەوڵەتی عێراق لە ساڵی١٩٩٠ لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکانەوە گەمارۆی ئابووری بەسەردا سەپێنراو، گەورەترین کاریگەریی ئەو گەمارۆیە پەیدابوونی دیاردەی هەڵئاوسان بوو، لەساڵی ١٩٩٣ رێژەکەی ٣٠٧,٦٪ بوو، لەساڵی ١٩٩٥دا بۆ ١٥٩٣,١٪* بەرز بووەوە، هەروەها ناوەندی بەرهەم رووی لە کەمبوونەوە کرد، بۆ نموونە هەر تاکێك ناوەندی بەکاربەری دانەوێڵەی لە ساڵی١٩٨٠، ٤٠١ کگم بووە، لە ساڵی١٩٩٥ بۆ ١٠٥,٢کگم

---

1خلیل أبراهیم الناصری: التطورات المعاصرة فی العلاقات العربیة الترکیة، دار الکتب والوثائق، بغداد، ١٩٩٠، ل/١٨٥.

2 تیم نبلوك: العقوبات والمنبوذون فی الشرق الاوسط، العراق، لیبیا،السوودان، مرکز دراسات الوحدة العربیة، بیروت،٢٠٠١، ل/٣٢-٣٣.

3 محمد وهیب السید: ازمة الاحتلال العراقی للکویت، دار النهضة العربیة، ١٩٩٨، ل/٩٨-٩٨.

4 الواردات حسب البلدان، اعداد: محمد نور الدین، مجلة شؤون ترکیة، مرکز الدراسات الاستراتیجیة والبحوث والتوثیق، عدد/٣، ل/١٢١.

* ئەم رێژەیە بەپێی پارەی عێراقی چاپکراوی ناوخۆ ئەژمار کراوە.

دابەزی، لە راپۆرتێکی تردا عێراق بە پێی رێبەری گەشەپێدانی مرۆیی نێودەوڵەتیی لە کۆی ١٧٤ دەوڵەت لە نەوەدەکاندا ریزبەندی ١٠٧ی هەبوو لە کاتێکدا لە هەشتاکان ٦٩یەمین دەوڵەت بووە[١].

هەرێمی کوردستان وەك تەواوی عێراق لە ژێر کاریگەری ئابڵووقەی ئابووری نێودەوڵەتیی بووە، کەمی پێداویستی بەتایبەتی خۆراك، گەورەترین کێشەی هەرێمی کوردستان بوو، سەرەڕای ئەمەش عێراق لە سەرەتای ساڵی١٩٩٢ بە دواوە وەك تۆڵەیەك لە پای جیابوونەوەی هەرێمی کوردستانو پێکهێنانی پەرلەمانو حکومەت، ئابڵوقەیەکی ئابووری ناوخۆیی بە سەردا سەپاندبوو[٢]. ئامانج لەو کارە، وەك سەرەك کۆماری عێراق سەدام حسین، رایگەیاند، پەیداکردنو بەهێزکردنی دەنگی ناڕەزایی جەماوەری کورد بوو لە دژی سیاسەتی حکومەتی هەرێم[٣]، حکومەتی عێڕاق گرفتێکی گەورەی بۆ سەرمایەی هەرێمی کوردستان دروست کرد ئەویش کێشانەوەی پارەی ٢٥ دیناری بوو کە بە نزیکی بڕی ٢٠ ملیۆن دۆلار زیانی لێکەوتەوە[٤]، لەلایەکی دیکەشەوە هەرێم هاوبەشی عێراق بوو لە کێشە ئابوریەکان، بۆ نموونە هەڵئاوسان لە پارێزگای سلێمانی ساڵی ١٩٩٤، ٣٤٪ بووە، لە ساڵی١٩٩٧ بۆ رێژەی ٦٥٪* بەرز بۆتەوە، هەروەها بێکاری کێشەیەکی تر بوو، بۆ نموونە رێژەکەی لە پارێزگای سلێمانی ساڵی ١٩٩٠، ١٦,٣٪ بووە، لە ساڵی ١٩٩٧ گەیشتبووە ٣٥,٢٪[٥].

لە کاتێکدا هەرێمی کوردستان دوو ئابڵووقەی لەسەر بوو، ژێرخانی ئابووری بە تەواوی پەککەوتوو بوو، کەرتی کشتوکاڵ بە شێوەیەکی سەرەکی پشتی بە دێهاتەکان بەستبوو کە ئەویش خاپور بوون، لە ساڵی ١٩٦٣-١٩٨٨ ژمارەی ئەو گوندانەی راگوازراوو تێکدرا بوون لە پارێزگای سلێمانی ١٣٤٧، هەولێر ٧٦٨، دهۆك ٥٦٧ گوند بوون[٦]. واتە کۆی گشتی ٢٦٨٢ گوند، بە هەمان شێوە کەرتی پیشەسازی زۆر لاواز بوو تەواو لەکار کەوتبوو، بۆ

---

1 مجموعة الباحثين: الاقتصاد العراقى ومتغيرات البيئة العربية والدولية، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٢، ل٤١٨-٤٢٠.

2 دیڤد مەکداوڵ: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل٦٢٨.

3 خطاب صدام حسين بمناسبة بيان ازار، جريدة الجمهورية ، العدد ٨١٤٠ ، ١٢\١٠\١٩٩٢، ل/٢.

4 جيهانگير كرمى: گزارش از تحولات شمال عراق در هه١٩٩٠ ٧٦-١٣٦٩ ، مجله سياست دفاعى ، شماره ٢١-٢٠، ١٣٧٦، ل/٢٠٥-٢٠٦.

* ئەم رێژەیە بەپێی پارەی چاپی سویسری دەرکراوە.

5 اسماعيل مصطفى عبدالرحمن: واقع البطالة فى اقليم كوردستان، مع تركيز خاص على محافظة السليمانية ١٩٩٠-٢٠٠١ ، گۆڤاری سەنتەری ستراتیجی کوردستان، ژمارە/٣ ، ساڵی سیانزەهەم، ٢٠٠٥، ل/٢٣٩-٢٤٠.

6 خليل إسماعيل محمد، اقليم كردستان العراق، ل/١١١.

نموونە بەرهەمی کارگەی چیمەنتۆی تاسلۆجە لە ساڵی ١٩٨٦دا ساڵانە ٢ ملیۆن تەن بووە، لە ساڵی ١٩٩٢ لەبەر نەبوونی کەرەسە سەرەتاییەکان بۆ ٣٨٤٢٥٥ تەن دابەزیوە[1].

لە بەرامبەر لاوازیی کەرتی کشتوکاڵیو پیشەسازیدا هەرێمی کوردستان تەنها داهاتی باجو گومرگ بوو، وەك لە راپۆرتێکی وەزیری دارایی حکومەتی هەرێمدا هاتووە بۆ ساڵی ١٩٩٣، باجەکان بریتی بوون لە باجی خانووبەرەو کرێی ئاوو کارەبا رەسمییەکان، بەپێی ئەو راپۆرتە داهاتی بۆ حکومەتی هەرێم کەمبووە، بەڵام گومرگ داهاتی سەرەکی گەنجینەی هەرێمی کوردستان بوو[2] بە جۆرێك ساڵی ١٩٩٤ رێژەی ٩٢٪ داهاتی حکومەتی هەرێمی پێك دەهێنا[3].

گومرگ، ئەو کەلو پەلانەی دەگرتەوە کە لە ئێرانو تورکیاو عێراقەوە دەهاتنە ناو هەرێمەوە، بەڵام ئەم داهاتە بە شێوەیەکی سەرەکی لە رێگای تورکیا—هەرێمی کوردستان دەستدەکەوت. ئەم رێگەیە لە پێش راپەرینی١٩٩١، سەرەکیترین رێگای پەیوەندیی زەمینی نێوان عێراقو تورکیا بوو، بەم شێوەیە موسل-فایدە—جزیرە-زاخۆ-دیاربەکر[4] بەڵام لە دوای ساڵی ١٩٩١ ئەم رێگایە کەوتە ژێر دەستەڵاتی هەرێمی کوردستانەوەو بەم شێوەی لێهات:

- رێگای هەولێر — شەقلاوە — هەریر — باتاس — ئاکرێ - ئەتروش- زاوێتە - دهۆك- زاخۆ- دیاربەکر[5].
- سلیمانی- رانیە — بالیسان- دیانە — هەریر- باتاس -ئاکرێ - ئەتروش - زاوێتە- دهۆك - زاخۆ-دیاربەکر .

بایەخی ئەم رێگەیە لەرووی ئابوورییەوە بۆ هەرێمی کوردستان لەوەدا بوو کە دەستی بەسەر هەموو جۆرە پەیوەندییەکی زەمینی راستەوخۆی نێوان عێراقو تورکیا گرتبوو، هەناردەو هاوردەی نێوان هەردوو دەوڵەت پێویست بوو لەم رێگایەوە بێت، هاوکات گرنگترین رێگای بازرگانیی دەرەوەی هەرێم بوو، هەموو شمەكو پێداویستییەکانی ژیانی رۆژانەی لەم رێگایەوە دابین دەبوو، دواجار بەهۆی ئەم رێگایەوە بازرگانییەکی ناڕاستەوخۆ لە نێوان تورکیاو ئێران پەیدا بوو، بۆ کەلوپەلەکانی وەك جگەرەو خواردنەوەی سەرخۆشکەر. بەڵام

---

1 جزاتوفیق طالب: المقومات الجیوبولتیکیة للامن القومي، ل/٣٢٥.

2 ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق، پرۆتۆکۆلەکان، بەرگی شەشەم، ل/٣٢٣.

3 گوڵدران عبدالرحیم عزیز: واقع النشاط التجاري فی اقلیم کوردستان-العراق، ١٩٩٣-١٩٩٨، رسالة ماجستیر غیر منشورة، کلیة الادارة والاقتصاد، جامعة دهوك، ١٩٩٩، ل/١٤١.

4 نصیف جاسم المطلبی: موقع ترکیا الجیوستراتیجي، ل/٣٥-٣٦.

5 جزاتوفیق طالب: المقومات الجیوبولتیکیة للامن القومي، ل/٣٦٤.

خاڵی سەلبی ئەم ڕێگەیە ئەوەبوو تورکیا دەسەڵاتی تەواوی بە سەردا هەبوو، کە کردبوویە گرنگترین کارتی فشار بەسەر هەرێمی کوردستانەوەو لە کاتی پێویستدا بەکاری دەهێنا، بەتایبەت لە ناجێگیرکردنی نرخی دۆلار بەرامبەر دینار لە بازاڕی هەرێمی کوردستاندا.

پەیوەندیی ئابووریی نێوان هەرێمی کوردستان‌و تورکیا شێوەیەکی فەرمی وەرگرتبوو، بازرگانەکانی هەرێم دەیانتوانی هەموو جۆرە شمەك‌و کاڵایەك لە تورکیاوە بهێنن، بە مەرجێك پێشتر فۆرمی ڕێگەپێدانی بریکاری بازرگانی لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە بۆ دەربکرایە، لە کاتێکدا ئەم شێوەیە لە نێوان ئێران‌و هەرێمی کوردستاندا نەبوو،[1] چونکە ئێران بە وێنەی تورکیا هیچ جۆرە پابەندییەکی نەبوو بەرامبەر هەرێم، کە لە ئەنجامی بڕیاری ٦٨٨ بە هاوبەشی لەگەڵ هاوپەیمانەکان پابەندی پاراستنی هەرێمی کوردستان کرابوو.

بازرگانیی نێوان تورکیاو هەرێمی کوردستان ساڵ لە دوای ساڵ لە گەشەکردندا بوو، بە جۆرێك ساڵی١٩٩٣، تەنها ٢٣١ بریکاری بازرگانی لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە ڕێگەپێدراو بوون، ئەم ژمارەیە ساڵی١٩٩٨ بۆ ١٣٧٥ بریکاری بازرگانی بەرزبۆتەوە. تەواوی ئەم جووڵەیە لە خاڵی گومرگی ئیبراهیم خەلیل ئەنجام دەدرا، کە شاندێکی کۆنگرێسی ئەمریکا بڕی داهاتی ڕۆژانەی ئەم خاڵە گومرگییەی بە ١-٢ ملیۆن دۆلار لە ساڵی ١٩٩٩دا مەزەندە کردووە[2].

دەکرێت سروشتی هەناردەو هاوردەی بازرگانی نێوان هەرێم‌و تورکیا لە ١٩٩١-١٩٩٨ بەسەر دوو قۆناغدا دابەش بکەین:

## ١- قۆناغی یەکەم ساڵانی ١٩٩١-١٩٩٥:

لەم قۆناغەدا تورکیا سەرەکیترین سەرچاوەی خۆراکی دانیشتوانی هەرێم بوو، هاوردە بە پلەی یەکەم خۆراکی سەرەکی بوو، بۆ نموونە ساڵی ١٩٩٣ ڕێژەی ٢٦,٥٪ هەبوو، پاشان جگەرەو خواردنەوەی سەرخۆشکەر دەهات، کە هەریەکەیان بەڕێژەی ٢٤,٧٪ هاوردە دەکران‌و بە زۆریی رووەو بازاڕی ئێران دەچوون دواجار شمەکی کەمالیات‌و کەرەستەی خانوو دروستکردن...هتد، ئاستێکی نزمتریان هەبووە[3].

---

1 صباح صابر محمد خوشناو: دور الضرائب الگمرگیه فی تنشیط حركة التجارة فی أقلیم كردستان، رسالة ماجستیر غیر منشورة، قسم الإقتصاد، كلیة علوم الأقتصاد، جامعة دهوك، ١٩٩٩، ل/١١١.

2 تیم نبلوك: العقوبات والمنبوذون، ل/١١١.

3 گوڵدران عبدالرحیم عزیز: واقع النشاط التجاری، ل/١٢٤.

لەهەمان قۆناغ هەناردەی هەرێم بۆ تورکیا سوتەمەنی بوو، لە ڕێگەی بارهەڵگری تورکی کە ڕۆژانە ژمارەیان لە ١٠٠٠ دانە تێپەڕی دەکرد،[1] دوای ئەوەی کەلوپەلیان لە هەرێم دادەگرت، لە گەڕانەوەدا سوتەمەنییان لە ناو بازاڕی هەرێم دەکڕیو لە کۆگای دروستکراوی تایبەتی دەیانگواستەوە بۆ تورکیا، بۆ هەر ١٠ هەزار لیترێك بڕی ١٥٠ لیتر سوتەمەنی وەك باج وەردەگیراو پاشان یەك لیتر ٢٥٠ فلس گومرگ دەکرا کە سەرچاوەیەکی گرنگی داهاتی بۆ دەسەڵاتی کوردی دابین کردبوو[2] هاوکات دیارییەکی هاوپەیمانان بوو کە چاوپۆشییان لە ناردنە دەرەوەی سوتەمەنی عێراق دەکرد بۆ تورکیا، لە بڕی ئەو زیانانەی کە لە دووەم جەنگی کەنداودا لێی کەوتبوو.

## ٢- قۆناغی دووەم ١٩٩٦—١٩٩٨:

نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٤/ئەپریل/١٩٩٥ بڕیاری ٩٨٦ی دەرکرد، بەو پێیە عێراق دەیتوانی هەر شەش مانگ جارێك هێندە نەوەت بفرۆشێت تا دەگاتە نرخی ٢ ملیار دۆلار، لە ٢٠/مایو/١٩٩٦ عێراقو نەتەوە یەکگرتووەکان لەم بارەیەوە گەیشتنە ڕێکەوتنێك، بە جۆرێك ڕۆژانە لە بەندەری ئەلبەکر لە باشووری عێراق ١,١٩ ملیۆن بەرمیلو لە بەندەری یومورتالیك ی تورکیا بڕی ٩١٤,٧٦٨ بەرمیل نەوت هەناردە دەکرا[3].

ئەم بڕیارەی نەتەوە یەکگرتوەکان بایەخێکی زۆری هەبوو، بۆ بووژانەوەی ئابووری لە هەرێمی کوردستان، چونکە بەپێی ئەو بڕیارە پێویست بوو تا ٣١/یەنایر/٢٠٠٠ بڕی ١٢,٤٪ لە پارەی نەوتی هەناردەی عیراق، بە سەرپەرشتی ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە هەرێمی کوردستان تەرخان بکرێ، لەم نێوانەدا حکومەتی عێراق، تەنها ئاگادار دەکرایەوەو ڕێگەی پێ نەدرابوو دەستبخاتە پارەی تەرخانکراوی هەرێم، لەبەر ئەمە ئابووریی هەرێم بە جۆرێك گەشەی کرد کە پێش بووژانەوەی ئابووری عێراق کەوتەوە، چونکە ئەو پارەیە تا ٣١/یەنایر/٢٠٠٠ بڕی ١,٥٦٢,٧٠٠ دۆلار، واتە ڕێژەی ٩,٤٪ بۆ شمەکی خواردەمەنیو دەرمانو پرۆژەی خزمەتگوزاری خەرجکرا، لە کاتێکدا عێراق بڕێکی باشی بۆ کڕینی چەكو دروستکردنی کۆشکی کۆماری تەرخان کردبوو[4].

---

1 جیف سیموند: عراق المستقبل، ل١٨٦-١٨٧.

2 گولدران عبدالرحیم عزیز: واقع النشاط التجاری، ل/١٣٤-١٣٥.

3 تیم نبلوك: العقوبات والمنبوذون، ل/٥١-٥٣.

4 بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل/٧٢، ١٠٥-١١١.

گەشەی ئابووری هەرێمی کوردستان کاریکردە سەر پەیوەندییە ئابورییەکانی نێوان هەرێمو تورکیا، بە جۆرێك شمەكو کاڵای هەناردەو هاوردە گۆڕانیان بەسەردا هات. کاتێك هاوردەی سەرەکی هەرێمی کوردستان لە ساڵانی قۆناغی یەکەم خۆراكو پاشان جگەرەو خواردنەوەی سەرخۆشکەر بوو، بەڵام لەم قۆناغەدا دەگۆڕێت، جگەرە دەبێتە پلەی یەکەمو لە ساڵی ١٩٩٨ بە رێژەی ٢٦,٩٪ی هاوردەی هەرێم بوو، ریزبەندی دووەم کەرەستەی خانوو دروستکردن بوو بە رێژەی ١٥,١٪، پاشان شمەکی خۆراکی بە رێژەی ١٣,٥٪ و دواتر پێڵاوو جلوبەرگو قوماش کە ساڵی ١٩٩٣ رێژەی ١,٣٪ هاوردە دەکران، لە ساڵی ١٩٩٨ بۆ ١١,١٪ گۆڕان، دواتر شمەکی کارەبایی لە ١,٥٪ گۆڕا بۆ ٩,٢ ٪، بەپێی ئەم ئامارە ئابورییانە، ئابووریی هەرێمی کوردستان بە هۆی بڕیاری ٩٨٦ گەلێك گۆڕانکاریی بەسەر هات، پێداویستییە سەرەکییەکان کە خۆراك بوون لە قۆناغی یەکەمدا بۆ کاڵای کەمالیات گۆڕاون.

ئەم بڕیارە بە دیوێکی تردا کاری کردە سەر جۆری هەناردەی هەرێم بۆ تورکیا بە جۆرێك لە قۆناغی یەکەمدا هەناردە تەنها سووتەمەنی بوو، لەم قۆناغەدا سووتەمەنی بەپێی بڕیاری ٩٨٦ هەرنادە دەکرا، چەند شمەکێکی دیکەی وەك خۆراکی دانەوێڵەو خورماو پێستە بوونە کاڵای سەرەکی بازرگانی[1] و بەردەوام لە زۆربووندا بوون، بە جۆرێك ساڵی ١٩٩٧ بە قورسایی ٧١٥٠ تەنو ٧٦٧١٧ پارچە چۆتە تورکیا، لە ساڵی ١٩٩٨ ئەم ژمارەیە بۆ ١٠٣٨٠٢ تەنو ٢٨٤٠٧٩ پارچە زیادی کردووە[2].

## بنەمای شەشەم: مێژوو

مێژووی پێکەوەژیانی نوێو هاوچەرخی نەتەوەی کوردو تورك، چەندین رایەڵی کومەڵایەتیو ئابووریو سیاسیو ئایینی پەیدا کردووە، ئەم مێژووە رووداوو کێشەی جۆراوجۆری زۆری لەخۆ گرتوو، زۆرێکیان لە کاتو شوینی خۆی کاریگەرییان لەسەر دوارۆژ لەدەست داوە، بەڵام هەندێکیان وەك سروشتی مێژوو رەنگدانەوەیان لە سەر داهاتوو هەبووەو کاریان کردۆتە سەر پەیوەندییە سیاسییەکانی تورکیاو هەرێمی کوردستان کە گرنگترینیان ئەمانەن:

---

1 گولدران عبدالرحيم عزيز: واقع النشاط التجاري، ل/١٣١.

2 صباح صابر محمد خۆشناو: دور الضرائب الگمرگيه، ل/١١٥.

أ. **دەسەڵات:**

مەبەست لە دەسەڵات ئەو پەیوەندییەیە کە لە مێژوودا لە نێوان دەسەڵاتی تورکو کورد پەیدا بووە، تیایدا کورد لە ئاستی میرنشینەکانو تورک لە ئاستی دەسەڵاتی عوسمانی بەشداری کردووە. ساڵی ١٥١٤ لە سەروبەندی ململانێی نێوان عوسمانیو سەفەوی لە کوردستان، پەیماننامەیەك لە نێوان زۆرینەی میرانی کوردو عوسمانی واژۆکراو بوونە هاوپەیمانی یەکتر[١] .

دواتر سەرجەم میرنشینەکان تا ساڵی ١٨٥٠ لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە روخێنران، لێرەوە کورد سەرجەم دەسەڵاتی سیاسیی لە دەستدا، بەم جۆرە پەیوەندیی دەسەڵات لە نێوان کوردو تورك پچڕا، کە بۆ دوای رووخانی دەوڵەتی عوسمانیو دامەزرانی کۆماری تورکیا لە ساڵی ١٩٢٣ درێژەی کێشا.

پاش ئەوەی پەیوەندی لەدوای ١٤٠ ساڵ لە نێوان دەسەڵاتی کوردو تورك پێکهاتەوە، هەردوولا کێشەی متمانەو ئەزمون لە نێوانیاندا بە روونی دیار بوو، بۆ نموونە کاتێك تورگۆت ئۆزال لە میانەی هێرشی فڕۆکەوانی هاوپەیمانان بۆ سەر عێراق نوێنەری خۆی ناردە لای سەرکردایەتیی کورد، لە بەرامبەردا کورد باوەڕی نەدەکرد تورك داوای پەیوەندیی سیاسیان لەگەڵدا ئەکات[٢]، هەروەها سەرکردە تورکەکان لە ئەنجامی نا شارەزایی لە مێژووی کورد، باسیان لەوە دەکرد کە کورد نابێت دەوڵەتی هەبێت، چونکە لە مێژوودا دەوڵەتێکی بەو جۆرەی نەبووە[٣] .

ب. **پەیماننامەی سیڤەر و لۆزان :**

پەیماننامەی سیڤەر و لۆزان دوو سیمبولی نەتەوەیی کوردو تورکە، بەڵام بە پێچەوانەی یەکترەوە، سیڤەر ١٠/ئوگستۆس/١٩٢٠ ، بۆ کورد ئەو پەیماننامەیە کە یەکەم جار لە لایەن کۆمەڵی نیودەوڵەتییەوە دانی بە مافی کوردا نا لە بەندەکانی ٦٢،٦٣،٦٤، بەڵام بزووتنەوەی تورکی هۆکاری سەرەکی جێبەجێ نەکردنی بوو. هاوڕێك بەرامبەری لۆزان ٢٤/یۆلیۆ/ ١٩٢٣، بۆ تورك ئەو پەیماننامەیە بوو، کە مافی نەتەوەی تورکی ناساندو لەسەر ئەو بنەمایە دەوڵەتی تورکیا دامەزرا. مستەفا کمال ئەتاتورك لە ساڵی ١٩٢٧ بەم شێوەیە باسی لێوە دەکات: "بەڵگەنامەیەکە هێما لەشکستی گەورەی ئەو تاوانە دەکات کە چەندین

---

1اسعدی عوسمان: کوردستانو چوونە ناو قەڵەمڕەی عوسمانییەکانەوە، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە/١٢ ، ١٩٩٩، ل/١٥٠-١٥١.

2جوناثان راندل: امة فی شقاق، ل/ ١٢٤-١٢٥.

3 مجلة کردستان المجاهدة ، عدد ٢ ، ١٩٩٢، ل/٣٧.

سەدە بوو لە دژی ئوممەی تورکی دارێژرا بوو، لەو باوەڕەدا بوون بە سیڤەر ئەم کارەیان تەواو کردووە. بەڵام لۆزان کۆتایی بەم پیلانە هێناو سەرکەوتنێکی سیاسیی بەدەستهێنا، کە لە مێژووی سەردەمی عوسمانیدا وێنەی نییە". ساڵی ١٩٩٣ لە یادی ٧٠ ساڵەی واژۆکردنی لۆزاندا تورك بە گەرمی پێشوازیی لەم بۆنەیە کرد، سلیمان دیمیریل رایگەیاند: "لۆزان سیڤەری بۆ ٧٠ ساڵ دواخست، ئەوەی تێبینی دەکرا دوای ٦ مانگ لە واژۆکردنی سیڤەر دەوڵەتی کوردیو ئەرمەنی دروست دەبوو لە دواییدا ئەم بیرە جێبەجێ نەکرا، بەڵام تا ئێستاش لەمێشکدایە، ئەوەی ئێستا دەیانەوێت بەرچاومانی بخەن سیڤەرە"[1].

وتاری سەرەك کۆمارەکانی تورکیا بیرەوەری لەبیرنەچووی تورك بەرامبەر سیڤەرو لۆزان، هەروەها مەترسیان بەرامبەر نەتەوەی کورد پیشان دەدات، ئەمە لەسەر زمانی بولەنت ئەجەڤید دەردەکەوێت لە سەروبەندی دوای راگەیاندنی فیدراڵی هەرێمی کوردستان، لە پەرلەمانی تورکیا وتی: "دەوڵەتی کوردی لە دوای هەڵبژاردنەکان بەتەواوەتی دامەزراوە ئەوەی ماوەتەوە تەنها دانپیدانانی فەرمییەو تورکیاش لە رێگەی پەیوەندییەکانیەوە ئەم کاری کردووە، ئەو دەوڵەتانەی کە ئێمە بەهاوپەیمانیان دەزانین بە ئاشکرا خەریکی تاوتێ کردنی پەیماننامەی سیڤەرن بە تایبەت لە پەرلەمانی ئەوروپادا"[2].

لە راستیدا کورد سیڤەری کردۆتە بەشێك لە بیری نەتەوەیی، عەزیز یامولکی وەك هاوسەردەمو ئەفسەرو مێژوونوسێك دەڵێت: "بەڵگەنامەیەکی سیاسیی گرنگە بۆ کوردو کوردستانو زۆر پێویستە هەموو کوردێك بزانێ پەیماننامەی ناوبراو لە١٠/ئاب/١٩٢٠ مۆرکراوە"[3] هەروەها محەمەد هەمەوەندی پسپۆڕ لە بواری یاسا دەڵێت: "پەیماننامەکە هێزی یاسایی خۆی سەبارەت بە کێشەی کورد لەدەست نەداوە"[4].

**ت. ویلایەتی مووسڵ:**

ویلایەتی مووسڵ ناوێکی کارگێڕیی دەوڵەتی عوسمانی بوو بەو هەرێمە دەوترا کە ئێستا بە کوردستانی باشوور ناودەبرێت، ویلایەتەکە لە دوای شکستی دەوڵەتی عوسمانی لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا لەلایەن بریتانیا داگیر کرا، بە پێی رێکەوتننامەی ئاگربڕی مۆدرۆس لە ٣٠/ ئۆکتۆبەر/ ١٩١٨ بۆ بریتانیا هەبوو هەر ناوچەیەك داگیر بکات کە بە

---

1تركياالتسعينات- الصراع بين"سيفر"و"لوزان"، اعداد: محمد نور الدين، مجلة شؤون تركية ، عدد ٩ ، ١٩٩٣، ل/٣٩-٤٠.

2قوة المطرقة بين التمديد والهواجس، اعداد: محمد نور الدين، مجلة شؤون تركية ، عدد ٥ ، ١٩٩٣، ل/١٣-١٤.

3عەبدولعەزیز یامولکی: کوردستانو راپەڕینەکانی کورد، وەرگێڕانی: شێرزاد کەریم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل/٨٦.

4محەمەد هەمەوەندی: رەوایی راگەیاندنی فدرالیزم لەکوردستان، گۆڤاری سیاسەتی دەولی ، ژمارە/١٠ ، ١٩٩٤، ل/١٠٨.

خالێکی ستراتیجی دابنێت، لەم رێکەوتنەوە کێشەی ویلایەتی مووسڵ پەیدا بوو، چونکە بریتانیا پێی وابوو بەپێی رێکەوتننامەکە ویلایەتەکەی داگیر کردووەو مافی دەوڵەتی عوسمانی پێوەنەماوە، هەرچی دەوڵەتی تورکیای نوێش بوو وەك جێگرەوەی دەوڵەتی عوسمانی ویلایەتەکەی بە بەشێك لە دەوڵەتی تورکیاو بە پارچەیەکی دانەبڕاوی دەوڵەتەکەی دادەنا.

بەڵام بریتانیا بە سیفەتی هێزی ماندات لە عێراق، وەك بەشێکی دەوڵەتی عێراقی داکۆکی لە ویلایەتەکە دەکرد، ئەم دوو بۆچوونە جیاوازە چارەسەر نەکرانو خرانە بەردەستی کۆمەڵەی گەلان لیژنەیەکی تایبەت پێکهێنراو لە ساڵی ١٩٢٥ سەردانی ویلایەتەکەیان کرد[١] ،بە پێی راپۆرتی کۆتایی لیژنەکە بۆ کۆمەڵەی گەلان، بڕیار درا ویلایەتی مووسڵ بخرێتە سەر عیراقو لە ساڵی ١٩٢٦ یەکەم رێکەوتننامەی نێوان تورکیاو عیراق واژۆ کرا[٢] .

تورکیا بە لەدەستدانی ویلایەتەکە زۆر نیگەران بوو، یەکێك لە سەرکردەکانی تورکیا لەم بارەیەوە وتی: "مووسڵ وەك برینێکی قوڵ لە دڵی تورك دەمێنێتەوە"[٣] هەروەها کەمال ئەتاتورك بەم شێوەیە رای خۆی دەربری: " لەوانەیە چاوەڕێی کات بکەین تا بەهێز دەبینو دەستی بەسەردا دەگرین"[٤] ئەم وتارانە دەرگای کراوەیان خستەڕوو بە رووی داهاتووی سیاسەتی تورکیا بەرامبەر ویلایەتەکە، لە ساڵی ١٩٩١ لەمیانەی دووەمین جەنگی کەنداو ئەگەری رووخانی دەوڵەتی عیراقی، چاوتێبرینی تورکیا جارێکی تر سەری هەڵدا، بەڵام بە شێوازێکی نوێ، تورگۆت ئۆزاڵ دەربڕی ئەم سیاسەتە بوو کە وتی: "چەندین هۆکاری یاسایی‌و مێژوویی مەبەستی ویلایەتی مووسڵە هەن بۆ ئەوەی پەیوەندیی لە نێوان ئەوان واتە کورد و تورکیا لە ئایندەیەکی نزیکدا پێکبێت، ئەگەر بەغداد پێی وایە کوەیت بەشێك بووە لە خۆی ئەوا تەواوی عیراق خاکی عوسمانی بوو"[٥]، هەروەها سلێمان دیمیریل لە ساڵی ١٩٩٥ بە ئاشکرا ئەوەی راگەیاند کە ویلایەتی موسڵ تا ئێستاش بەشێکە لە تورکیا[٦] .

لە بەرامبەردا کورد هیوای ئەوەی دەخواست کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا باش بێت، لەم بارەیەوە جەلال تاڵەبانی لە ساڵی ١٩٩٢، ئەوەی بۆ سلێمان دیمیریل خستەڕوو، کە

---

1عثمان علي: دراسات فی الحرکة الکردیة المعاصرة ١٨٣٣-١٩٤٦، مکتب التفسیر، اربیل٢٠٠٣، ل٤٧-٥٦.

2 فاضل حسین: کێشەی ویلایەتی موسڵ، و: محەمەد شاکەلی، چاپخانەی خاك، سلەیمانی، ١٩٩٩، ل٢٢٩-٢٣٩.

3 بیار مصطفی سیف الدین: السیاسة البریطانیة تجاه ترکیا واثرها في کوردستان ١٩٢٣-١٩٢٦ ، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ٢٠٠٤، ل٢٦٥.

میشال نوفل واخرون: عرب والاتراك فی العالم المتغیر،الجزء الاول، مرکز الدراسات الأستراتیجیة والبحوث والتوثیق، بیروت، ١٩٩٣ ل/١٣١.

5 میشال نوفل واخرون: عرب والاتراك، ل١٣٠-١٣١ .

6 بڕوانە بەشی سێیەم تەوەرەی سێیەم

پەیوەندییەکی مێژوویی لە نێوان هەردوو نەتەوەی تورك‌و کورد هەیەو کار لە پێناوی زیندووکردنەوەی ئەکەین[1]، دەخوازین لەگەڵ تورکیا هاوپەیمان بین[2]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ترسێکی مێژوویی لای کورد هەبوو بۆ نموونە محەمەد فوئاد مەعسوم لە میانەی لەشکر کێشی تورکیا لە ۱۹۹۷دا بۆ کوردستان ئەوەی خستەڕوو کە پلانی تورکیا بۆ دەست بەسەرا گرتنی ویلایەتی مووسڵەو ئەم کارەی وەك داگیرکردنی ئیسرائیل بۆ شاری قودس لە فەلەستین وێنا کرد[3].

1 أصغر جعفر ولدانی: چشمداشت های ترکیا بەشمال عراق، مجلة إطلاعات سیاسی إقتصادی ، شماره ۹۸-۹۷ ل/۵۲-۵۳.

2 رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/۱۵۵ ، ۱۹۹۲/۸/۲ .

3 رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە/۱٤۹۷ ،۱۹۹۷/۱۰/۱٦ .

# تەوەرەی یەکەم

## پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو عێراق سەردەمی پاشایەتی و کاریگەرییان لەسەر باشووری کوردستان ١٩٢٦-١٩٥٨

سەرەتای پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو عێراق بۆ ١٦/ ئۆکتۆبەر/ ١٩٢٥ دەگەڕێتەوە، کاتێك بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گەلان ویلایەتی مووسڵ بە عێراقەوە لکێندرا، تیایدا هاتبوو:

١. هێڵی برۆکسل هێڵی سنووری نێوان عێراق‌و تورکیا بێت.

٢. لەسەر حکومەتی بریتانیا پێویستە پەیماننامەیەکی نوێ لەگەڵ عێراقدا واژو بکات‌و پێشکەشی ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلانی بکات، کە سیستەمی ماندات بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ لە عێراقدا مسۆگەر بکات.

٣. بریتانیا وەك هێزێکی ماندات لە عێراقدا، داوای لێدەکرێت ئەو کارانەی کە بریا وایە بۆ مسۆگەر کردنی مافی دانیشتوانی کورد بیگرێتە بەر، بەپێی ئەو ڕێنماییانەی لە ڕاپۆرتی لیژنەی لێکۆڵەرەوەدا دیاریکراوە* لە بەردەم ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلاندا ئامادەی بکات.

٤. پێویستە حکومەتی بریتانیا ڕاسپاردەی لیژنەی تایبەتی لێکۆڵینەوە جێبەجێ بکات[1].

پاش دانوستانێکی چەند مانگی لە نێوان تورکیاو بریتانیاو عێراقدا لە ٥ی یۆنیۆی ١٩٢٦ دا، یەکەم ڕێکەوتن لە نێوان عێراق‌و تورکیا واژۆ کرا، کە پێکهاتبوو لەسێ بەش‌و بەسەر هەژدە مادەدا دابەش کرابوو[2].

بەشی یەکەمی ڕێکەوتنەکە بە ناوی "سنووری نێوان تورکیاو عێراق" بوو، کە پێنج مادەو هاوپێچێکی لەخۆ گرتبوو، تیادا باس لە دیاریکردنی سنووری نێوان تورکیاو عێراق

---

* ڕێنماییەکانی لیژنەی لێکۆڵینەوە ئەمانە بوون: ١-پێویستە ویست‌و ئارەزووەکانی کورد ل/ەرووی دامەزراندنی فەرمانبەر لەشوێنە کارگێڕیەکانداو ڕێکخستنی کاری دادوەری و فێربوون لە قوتابخانەکان، بەهەند وەربگیرێت. ٢- زمانی کوردی لەم کارانەی سەرەوەدا دەبێت زمانی فەرمی بێت.٣- لەدوای ڕێکەوتننامەی ئەنگلۆ- عێراقی ، کۆمەڵەی گەلان چوار ساڵ سەرپەرشتی جێبەجێکردنی ئەم کارانە- دەکات، خۆ ئەگەر ئەم ماوەیە تەواو بوو، بەڕێوە بردنێکی خۆجێی محلی پەیمانی پێنەدرا، ئەوا زۆرینەی دانیشتوان دەسەڵاتی تورك لەعەرەب بەباشتر دەزانن"

{ SGPS...43...711..250..1-9-25}

1 بیار مصطفی سیف الدین: السیاسة البریطانیة تجاه ترکیا واثرها في کوردستان ١٩٢٣-١٩٢٦ ، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ٢٠٠٤، ل/ ٢٢٣.

2 بڕوانە دەقی ڕێکەوتننامەکەو هاوپێچەکەی پاشکۆی ژمارە/١ .

دەکاتو لیژنەیەکی هاوبەش ئەم کارە ئەنجام دەدات، بە گەڕانەوە بۆ هاوپێچی ئەم بەشە کە لەسەر نەخشە هیلّی برۆکسل ** دیاری کراوەو پاشان بەوردی باسی لێوە کردووە.

بەشی دووەم بە ناوی دراوسێیەتی باش- حسن الجوار لە گرنگترین بەشی ڕێکەوتنەکەیەو بەسەر هەشت مادەدا دابەش بووە، جەخت لەسەر توندکردنی سنووری هەردوو وڵات دەکاتەوە، لە دژی کەسانی سنوور بەزێن، هەر بۆ ئەم مەبەستەو گۆڕینەوەی زانیاری کاری تایبەت لە نێوان هەردوولادا ئەنجام دەدرێت.

بەشی سێیەم پێنج مادەیەو بە ناوی ئەحکامی گشتیی لە مافی کۆمپانیا نەوتییەکان دەدوێت کە لە داهاتی نەوتی باشووری کوردستان، بڕی ١٠٪ ی لە ماوەی ٢٥ ساڵدا بۆ دابین دەکرێت، هەروەها چەند بابەتێکی گشتی دیکە لە دووتوێی ئەم بەشەدا جێ کراوەتەوە.

ئەوەی لەم ڕێکەوتنەدا پەیوەندیی بە پرسی کوردەوە هەبێتو تێبینی دەکرێت، ئەوەیە لە بەشی یەکەمدا گەورەترین بەشی کوردستان، کە لە پێش یەکەمین جەنگی جیهانی بە کوردستانی ژێردەسەڵاتی عوسمانی دادەنرا[1] کەوتە بەردەم نەخشەیەکی نوێوەو دابەش بوو بەسەر دوو دەوڵەتدا، لێرە بە دووا واتە ٥/یونیۆ/١٩٢٦ لە تورکیا بە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیاو لە عێراق بە باکووری عێراق ناوبرا.

هەرچی بەشی دووەمە، جیاواز لەوەی پێشوو،کە خاك دابەش دەکات، بە ناوی دراوسێیەتی باشیەوە کۆمەڵێك چەمکی وەك کەسی چەکدار، یان کەسانی چەکدار دەخاتە فەرهەنگی پەیوەندییەکانی تورکیاو عێراقەوە، ئامانجی ئەم کەسانە بە چەتەیی‌و ئاژاوەگێڕی دەستنیشان دەکات، لێرەوە هەرچی ئەو پەیوەندییە سروشتییە کۆمەڵاتییو ئابووریو سیاسیەی نەتەوەی کوردە لەم بەشە دابەشکراوەی کوردستاندا، دەبێتە کاری چەتەیی‌و ئاژاوەگێڕی، بۆ ئەم مەبەستەش هەردوو حکومەتی تورکیاو عێراق لەسەر ئەوە هاوڕا دەبن ئەو کەسانەی ئەم سنوورە نوێیە دەبەزێنن تۆمەتبارنو دەبێت دەستگیر بکرێن، هەروەها دەبێت هەردوولا لەم بارەیەوە زانیاری ئاڵوگۆڕ بکەن.

هەر لەم بەشەداو لە مادەی دوانزەدا، ئاماژە بەوە دەکات لەسەر دەسەڵاتدارانی تورکیاو عێراق پێویستە، هیچ جۆرە پەیوەندییەکی سیاسیی لەگەڵ سەرەك خێڵو شێخی یەکتری نەبەستن. ئەم مادەیە بۆ خۆی دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەو کەناڵە دیپلۆماسیە هەرێمیەی لەو کاتەدا بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد کاری لەسەر دەکردو خوازیاربوو لە میانەی ناکۆکیە

** بڕوانە هاوپێچی ڕێکەوتنننامەکە.

1 بڕوانە: سەعدی عوسمان: کوردستان بەر لەچوونە ناو بازنەی دەسەلاتی عوسمانییەوە، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ، ژمارە/١٠، ل/١٦٠-١٦٢.

هەرێمیەکاندا سوودی لێوەربگرێت، بۆ نموونە شێخ مەحمودی حەفید لە ساڵی ١٩٢٣ لەیەك کاتدا پەیوەندیی لەگەڵ بەغدادو ئەنقەرە هەبوو[1].

بەدیوێکی تردا ئەم رێکەوتنە نزیکترین مەودای جێبەجێکردنی لە کوردستانەوە دەست پێدەکات، هەر لێرەوە بۆ یەکەم جار سنووری نێوان دوو تازە دەوڵەت دیاری دەکرێت، هەردوولا بۆ گرتنەبەری رێو شوێنی پێویست بە روی چالاکییە سوننەتییەکانی نەتەوەیەکدا بڕیار لەسەر تەواوی هاریکاری دەدەن. هەموو ئەمانە، بەڵگەی ئەوەن کورد وەك خەڵكو کوردستانیش وەك خاك — بە سەلبی یان ئیجابی بوو بێت- خاڵێکی هاوبەشو رایەڵێکی گرنگ بووە لە پەیوەندییە نوێیەکانی عێراق-تورکیا دا، هەر لەم بارەیەوە عێراق دوای کردنەوەی یەکەم باڵوێزخانەی خۆی لە ئەنقەرە لە ١٩٢٨ رایگەیاند "پەیوەندیینەکانی نێوان هەردوولا، نابێت بەهۆی کوردەوە ئاڵۆز بێتو بەرژەوەندیی هەردوولا لەوەدایە هاوئاهەنگی تەواو سەبارەت بە پرسی کوردی هەبێت"[2].

لەم سۆنگەیەوە دەبینین بەرژەوەندییەکانی نێوان تورکیاو عێراق لە ماوەیەکی کورتدا، هێندە ئاوێتەی یەکتر دەبن، کاردەکەنە سەر پەیماننامەی ئەنگلۆ- عێراقی١٩٣٠، کە بە هۆیەوە عێراق سەربەخۆیی بەدەست دەهێنێت. بە مانایەکی تر، جۆری سەروەریو کێشەی ناوخۆیی وەك کێشەی کورد لە عێراقدا، هەروا ئازادانەو بەبێ رەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانی تورکیا بڕیاری لەسەر نەدرا. ئەوە بوو تورکیا لە ساڵی ١٩٣٠دا ئاگاداری دانوستانەکانی نێوان بریتانیاو عێراق بوو بۆ واژۆکردنی پەیماننامەیەك کە عێراق لە ماوەیەکی کەمدا سەربەخۆیی بەدەست دەهێنێت، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا لە باشووری کوردستاندا بە وردی چاودێری کارو کردەوەی بریتانیای دەکرد، کە دەبوو بەپێی رێنماییەکانی لیژنەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەی گەلان مافی کارگێڕیو رۆشنبیری بۆ کورد مسۆگەر بکات، تورکیا ئەمەی بە پلانێکی بریتانیا دەزانی بۆ هۆشیار کردنەوەی کوردو گومانی ئەوەی هەبوو بریتانیا دەیەوێت لەرێی بارودۆخی باشووری کوردستانەوە باکووری عێراق باری ئاسایشی باکووری کوردستان باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا ئاڵۆز بکات.

هەر بۆ ئەم مەبەستەو بە فەرمی لە چەند یاداشتنامەیەکدا، لە ٢١و ٢٨ی جولای، ٢/ ئۆگستۆس/١٩٣٠، تورکیا بە توندی رەخنەی لە سیاسەتی حکومەتی عێراقی گرت لە شێوەی هەلسوکەوتی لە بەرامبەر کورددا بە "نەرمو نیان" وەسفی کردو هۆشداری بە عێراق

---

1 ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢ ، چاپخانەی زانست، ٢٠٠٢، ل١٦١-١٦٢.

2 عثمان علي: دراسات في الحركة الكردية المعاصر ١٨٣٣-١٩٤٦، مكتب التفسير، اربيل٢٠٠٣، ل/ ٥٤٨.

دا، که سیاسەتی بریتانیا لە باشووری کوردستان بە جۆرێکە دەخوازێت دۆخێکی شلۆق لە ناوچەکەدا بە گشتیو لە تورکیا بە تایبەتی لە ئارادا بێت. لەم بارەیەوە بەرپرسانی حکومەتی عێراقی، لە تێڕوانینیاندا بۆ سیاسەتی بریتانیا بەرامبەر کورد، هاوڕای بۆ چونەکانی تورك بوون[1] هەموو ئەمانە هۆکارگەلێ بوون، بریتانیا لە نێوان تورکیاو عێراقو کۆمەڵەی گەلانو کورددا، ڕۆڵی دادوەر ببینێت. لەلایەك بەهۆی ڕێکەوتننامەی ١٩٣٠ لەگەڵ عێراقدا، نیگەرانی حکومەتی عێراقو تورکیای ڕەواندەوە، لەوەدا کە سەربەخۆیی عێراقی لە ١٩٣٢دا، بە توانایی دەوڵەتی عێراقی لە زامنکردنی مافەکانی کورد نەبەستەوە[2] .لەلایەکی تریشەوە، بەهۆی ئەو کارو چالاکیانەی بەرێژەیەکی کەم لە باشووری کوردستان ئەنجامیدا توانی کۆمەڵەی گەلان بخاتە سەر ئەو ڕایەی کە بریتانیا پێشنیارەکانی لیژنەی لێکۆڵینەوەی جێبەجێ کردووە[3]، بەڵام ئەو لایەنەی لەم گەمە سیاسییەدا دۆڕاندی کورد بوو، چونکە بۆ جاری سێیەم لە دوای "ڕێکەوتننامەی سێڤەر"و "کێشەی ویلایەتی مووسڵ"، هیوای سەربەخۆیی[4]، یان نیمچە سەربەخۆیی لەدەست دا[5]، هەرچی هەوڵو چالاکیەکانی کورد بوون، کە لە یاداشتنامەی کەسایەتییە سیاسییەکانو سەرکردە کوردەکانو هەروەها ڕاپەڕینی ٦/ئەیلول/ ١٩٣٠ بەرجەستە بوون، هیچ ئەنجامێکی لێنەکەوتەوە[6] .

جێگری مەندوبی سامی بریتانیا لە عێراق مێجەر یۆنگ بە ڕاشکاوانە لەبەردەم ناودارانی کورد لە سلێمانی ڕایگەیاند: "سەیر دەکەم بەعزێ جیهاتی نامەسئول وای دەهێنێتە پێشەوە کە تەشجیع کردنی حەرەکەتی قەومی کوردی سیاسەتێکی قەتعی حکومەتی جەلالەتی مەلیکی بریتانیایە. ئەمە نەك تەنها بۆ عێراق، بەڵکو بۆ دراوسێو دۆستەکانی تری کە حکومەتی ئێرانو تورکیایە، موجبی ئیرتیباك دەبێت، هیچ شتێك نییە کە لەمە زیاتر لە حەقیقەت دوور بێت. هەر کەس تەصەوری ئەوە بکات کە بەهاتنی بۆلای

1 هەمان سەرچاوە، ل٥٤٩-٥٥١

2 بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: دەقی ڕێکەوتننامەکە لە کتێبی{ عبدالرزاق الحسني تاریخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، مطابع دار الشؤون الثافية العامة، ١٩٨٨، ل١٧١}.

3 عوسمان علي: دراسات في الحركه، ل٥٥٦-٥٥٧.

4 ڕۆژنامەی ژیان ، ژ٢٥٢ی ٢١ی /٧/١٩٣٠.

5 نەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردستانی عێراق- سەردەمی قەڵەم و موراجەعات ١٩٢٨-١٩٣١ ، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی١٩٩٩، ل٢٤٩-٢٦٧.

6 هەمان سەرچاوە، ل٥٩-٦٢.

فەخامەتی مەندوبی سامی، یان بۆلای من، بۆ سیاسەتێکی وەها تەشجیعی دەست دەکەوێت، خەتایەکی گەورە دەکات"[1].

لەگەڵ ئەمەدا، بریتانیا هەڵوێستی خۆی، لەم بارەیەوە بە روونو ئاشکرایی بۆ تورکیا لە دێسەمبەر/١٩٣٠دا دەردەبڕێت: "سیاسەتی حوکمەتی خاوەن شکۆ وەك هێزی ئینتیداب لە عێراقدا، ئەوە بوو کە عەرەب هان بدات بەتعاطفو عەدالەتەوە رەفتار لەگەڵ کورددا بکەنو کورد هان بدەن کە وەك هاووڵاتیی دڵسۆزی دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراق بژین. بیری کوردستانێکی سەربەخۆ گەوجانەو لەجێبەجێکردن نەهاتووە، هەروا تاوانێك دەربارەی ئەوەی کە حکومەتی خاوەن شکۆ هانی دابن درۆبوو"[2] کۆمەڵەی گەلان لای خۆیەوە لە ٣١/دیسەمبەر/١٩٣٠دا چەند بڕیارێکی لەم بارەیەوەدا، لەگرنگترینیان: "هەموو داواکارییەکانی سەرانی کورد بۆ پێکهێنانی حکومەتی سەربەخۆ لەژێر سەرپەرشتیاری کۆمەڵەی گەلان رەتکرایەوە"[3].

بە پشتبەستن بەو بەڵگە مێژووییانەی پێشوو، ئەو راستییە روون دەبێتەوە کە سیاسەتی بریتانیا بەرامبەر باشووری کوردستان بە تایبەتی لە دوای ١٩٢٦، بریتی بووە لەوەی کورد لەو بەشە نوێیەی کە بە باکووری عێراق ناوبرا، هەڵگری ناسنامەیەکی عێراقی بێتو بە هیچ جۆرێك لەگەڵ هاونیشتمانییە کوردستانییەکانی لە تورکیاو ئێراندا پەیوەندیی نەبێت، هاوکات نەریتێکی بۆماوەیی بۆ دەوڵەتی عێراق بەجێهێشت، کە پێش ئەوەی هەر هەنگاوێك سەبارەت بە باشووری کوردستان هەڵبنرێت، ئەگەر راوێژ بەتورکیا نەکرێت، ئەوا پێویستە بەرژەوەندییە باڵاکانی بەهەند وەربگیرێت.

پەیوەندییەکانی نێوان عێرراقو تورکیاو کاردانەوەیان لە سەر بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە باشووری کوردستان، بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە بزووتنەوەی شێخ ئەحمەدی بارزاندا ١٩٣١-١٩٣٢ بەرجەستە بوو، کە لەو کاتەدا لە سەر سنووری عێراقی-تورکی شێوە سەربەخۆییەکی هەبوو[4]. ئەمە بەڵگەیەك بوو بە دەستی تورکیاوە بۆ ئەوەی رەخنە لە حکومەتی عێراق بگرێت کە ناتوانێت وەك پێویست سنوورەکانی خۆی کۆنترۆڵ بکات[5]

---

1 رۆژنامەی ژیان ، ژ٢٥٨ی ١٩٣٠/٨/٢٨.

2 نەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردستانی عێراق، ل٤٠.

3 عثمان علی: دراسات فی الحركة الكردية، ل٥٥٧.

4 بۆزانیاری زیاتر لەسەر ئەم بزووتنەوەیە، بڕوانە: کیکاوس نوری قفطان: الانتفاضات البارزانية صفحات من الحركة القومية التحررية الكردية فی النصف الاول من قرن العشرين، مطبعة سەرکەوتن، ٢٠٠٢، ل٦٢-٧٢.

5 جليلی جليل واخرون: الحركة الكردية فی العصر الحديث، بيروت، ١٩٩٠، ل١٧٣.

سەردانی شاندی باڵای عێراق بۆ تورکیا بە سەرۆکایەتیی نوری سعید *، لە ٩/ دیسەمبەر/١٩٣٠دا زیاتر ئەم گازاندانەی تورکیای گەرموگوڕتر کردو لەم سەردانەدا بزووتنەوەی بارزان تەوەرەی سەرەکی وتووێژی نێوان هەردوولا بوو، نیگەرانیی تورکیا لەوەدا بوو کە شێخی بارزان یارمەتی شۆڕشی کوردیی لە چیای ئاگری داغ ١٩٢٨-١٩٣٢ داوە، لەبەر ئەوە تورکیا داوای کرد بۆ پشتگرتن لە شۆڕشگێڕان، خاکی عێراق بەکار بهێنێت. لە بەرامبەردا تورکیا تەواوی ئامادەباشیی خۆی دەربڕی بۆ هاوکاری کردنی حکومەتی عێراق بە مەبەستی کپ کردنەوەی بزووتنەوەی بارزان[1]. حکومەت عێراقی لای خۆیەوە، چەند زانیارییەکی پێشکەش بە لایەنی بەرامبەر کرد سەبارەت بە پشتگیریی‌و پەیوەندیی‌و هاوکاریی کوردیی تورکیا بۆ کوردی عێراق لە کێشەکانیان لەگەڵ دەوڵەتدا. هەمان کات پرۆژەی هاوکاریی سەربازی نێوان تورکیاو عێراقی بەهەند گرت، لەگەڵ ئەوەشدا پەسەندی نەکرد، لەبەر چەند هۆکارێك کە ئەمانە بوون:

(١) سنووری عێراقی- تورکی تا ئەو کاتە، لەلایەن لیژنەی دیاریکردنی سنوور، لە سەر زەمین نەخشەڕێژ نەکرا بوو، ئەمە وای کردبوو هەردوولا سنووری خۆیان بە تەواوی لاڕوون نەبێت، یان ئەگەر ئاشکراش بێت ئەوا بە رەسمی لەلایەن هەردوولاوە دانی پیادا نەنرا بوو.

(٢) بریتانیا ئەم دەست پێشخەرییەی تورکیای پێ پەسەند نەبوو، چونکە پێی وابوو ئەم هەوڵە دەبێتە هۆی لاوازکردنی سەروەریی عێراق لە کۆمەڵەی گەلاندا، دواجار کاریگەریی لە سەر سەربەخۆیی ئەم دەوڵەتە دەبێت[2].

(٣) حکومەتی عێراق ترسی دەست تێوەردانی تورکیای هەبوو لە باشووری کوردستان، ئەمەش لەو خاڵەوە سەرچاوەی گرتبوو کە عێراق پێی وابوو تورکیا هێشتا لە ویلایەتی مووسڵ بێ ئومێد نەبووەو بە پێی پێشنیاری لیژنەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەی گەلان بەستنەوەی ویلایەتی مووسڵ بە تورکیاوە ئەگەرێکە هێشتا لە بووندایە. لەبەر ئەوە بەکارهێنانی کارتی کوردیی لە لایەن تورکیاوە بۆ هێنانەکایەی دوخێکی نائارام لە عێراقدا بە دوور نەدەزانرا، ئەوەی ئەم گومانەی بەرەو باوەڕی تەواو دەبرد عێراق ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستا بوو کە شێخ ئەحمەدی بارزان لە ١٩٢٨ دا یارمەتی لە تورکیا وەرگرتووە[3].

---

* لە بنەماڵەیەکی بە رەگەز کورد لەکۆتایی سەدەی نۆزدە لە دایکبووە، وەك ئەفسەرێك لە سەرەتای یەکەم جەنگی جیهانیدا بەشداربووە، دواتر لە ساڵی ١٩٣٠دا بۆ یەکەم جار بووە بە سەرۆك وەزیرانی عیراق‌و لەساڵی ١٩٥٨دا کوژراوە.

1 عثمان علي: دراسات في الحركة الكردية، ل٥٩٧.

2 هەمان سەرچاوە، ل٥٤٩.

3 هەمان سەرچاوە، ل٥٨٠-٥٨٣.

ئەم هۆکارانەی سەرەوە وایان لە حکومەتی عێراق‌و بریتانیا کرد پێشنیاری تورکیا پشتگوێ بخەن‌و بیر لەوە بکەنەوە کە پێش ئەوەی تورکیا دەست لە کاروباری ناوخۆی عێراق وەربدات، ئەوان خۆیان چارەسەری گونجاو بۆ بزووتنەوەی بارزان بدۆزنەوە.

رێکەوتننامەی نێوان تورکیاو عێراق لە ئەنقەرە لەسەردەستی مەلیکی عێراق، فەیسەڵی یەکەم ۱۹۲۱-۱۹۳۳و سەرۆکی تورکیا مستەفا کەمال ۱۹۲۳-۱۹۳۸ لە ۱۹۳۱ واژۆ کرا، تیایدا کۆتایی بەدیاریکردنی سنوور لەسەر نەخشەو زەمینی هەردوولا هات[1]. دوابەدوای ئەوەی عێراق دڵنیابوو کە هێڵە سنوورییەکان رێگە لە دەست تێوەردانێکی تورکی دەگرێت، هێرشی سەربازی عێراقی‌و بەیارمەتیی هێزی ئاسمانیی بریتانیا بۆ سەر ناوچەی بارزان دەستی پێکرد، لە ئەنجامدا بزووتنەوەی بارزان تووشی نوشست هات‌و شێخ ئەحمەدی بارزان بە ٤٠٠ خێزانەوە پەراگەندەی تورکیا بوو[2]. کێشەیی بارزانییەکان لێرەدا کۆتایی پێ نەهات، بەڵکو لەگەڵ کێشەی ئاشورییەکانی عێراق[3]، هەردوکیان بوون بە کاڵایەك، لە نێوان عێراق‌و تورکیادا ئاڵوگۆری پێکرا، تورکیا شێخ ئەحمەدو بارزانیەکانی دابەدەستی حکومەتی عێراق، لە بەرامبەریشدا عێراق بزووتنەوەی ئاشوریەکانی لە باشووری کوردستان سەرکوت کرد، ئەو بزووتنەوەیەی کە تورکیا مەترسی ئەوەی لێ هەبوو بریتانیا وەك کارتێکی فشار لەسەر سنووری نێوان تورکیاو عێراق لە دژی تورکیا بەکاریان بهێنێت[4].

دەکرێت کۆی ئەم باسەی پێشوو بەقۆناغی یەکەمی پەیوەندییەکانی نێوان عێراقی پاشایەتی‌و تورکیا سەبارەت بە باشووری کوردستان ناو ببرێت، لەم قۆناغەداو دوای واژۆکردنی دوو رێکەوتننامە، کۆتایی بەهەموو داواکارییەکانی تورکیا سەبارەت بە باشووری کوردستان هات، لەلایەکی تریشەوە پرسی کورد بەگشتی‌و لە باشووری کوردستان بەتایبەتی بوو بە کێشەیەك کە هەردوو دەوڵەت بەپێی رێکەوتنی ۱۹۲٦ دەبوو زانیاری لەم بارەیەوە ئاڵوگۆڕ بکەن. دوابەوای ئەم قۆناغە پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو عێراق چەند گۆڕانکارییەکیان بەخۆوە بینی‌و پرسی کورد لەم نێوەندەدا پێ بەپێی ئەم گۆڕانکارییانە لە جۆری مامەڵەکردندا شێوازی نوێی بەخۆوە بینی.

---

1 نصیف جاسم المطلبی: موقع تورکیا الجیوستراتیجی وأهمیته للعراق، رسالة دکتوراه غیر منشورة، قسم الجغرافیا، کلیة الآداب، جامعة بغداد، ۱۹۸٦.، ل۲٥٥.

2 مسعود البارزاني: بارزان والحرکة التحرریة الکردیة إنتفاضة بارزان الأولی ۱۹۳۱-۱۹۳۲ ، کوردستان، ۱۹۸٦، ل٤٥.

3 بۆ زانیاری لەبارەی کێشەی ئاشورییەکان بڕوانە: {عبدالرزاق الحسني: تاریخ العراق السیاسي الحدیث، الجزء الثالث، دار الکتب، بیروت، ۱۹۷٥، ل۲۷۳-۲۸٤}.

4 کاوس قفطان: الانتفاضات البارزانیة، ل۸٥.

له ساڵی ۱۹۳٦دا ڕێکەوتننامەی ۱۹۲٦ دەستکاری کرا، هەرچی بەشی یەکەمو سێیەمی ڕێکەوتننامەکە بوو بەنەگۆڕی مانەوە، بەڵام بەشی دووەم لە ڕێکەوتنەکە ماوەکەی ۱۰ ساڵ بوو، هەریەك لە تورکیاو عێراق ڕەزامەندیی خۆیان دەربڕی لەسەر نوێکردنەوەی ئەم بەشە بۆ ۱۰ ساڵی دیکە دوای گۆڕینی بڕگەی یەکەم لە مادەی ۱۳ لە بەشی دووەم کە پێشتر بەم شێوەیە بوو "ئەم لیژنەیە هەرسێ مانگ جارێك یان زیاتر کۆدەبێتەوە"[1] گۆڕدراو کرا بە " شوێنو کاتی کۆبوونەوەی لیژنەکە لەلایەن هەردوو حکومەتەوە دیاری دەکرێت "[2]. دیارە دووبارە درێژکردنەوەی ئەم ماوەیەو گۆڕانکاری لە بڕگەی مادەی ۱۳ ڕەهەندی تایبەتی خۆی هەیە، یەکەمیان ئەوە دەردەخات کە تورکیاو عێراق لە ماوەی ئەو دەساڵەی پێشوودا، نەیانتوانیوە سنوورەکانیان بە ڕووی پەیوەندییەکانی نێوان ئەم دوو بەشەی کوردستاندا توند بکەن، دووەمیان ئەوە دەخاتە ڕوو بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد شوێنو کاتێکی دیاریکراوی بۆ نییە، بەڵکو بەپێی ڕووداوە ناوخۆیو دەرەکییەکان لە ئاستێکی ئاسۆییدا بەرزو نزم دەکات هەر بۆیە لیژنەی تایبەت لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتە، بەپێی کاتو شوێنی ڕووداوەکان کۆبونەوەی خۆی ئەنجام دەدات، نەك پابەند بێت بە کاتێکی دیاری کراو.

دوابەدوای ئەم ڕێکەوتننامەیە، پاکتی سعد ئاباد له ۸/ یۆلیو/۱۹۳۷ لە نێوان تورکیاو عێراقو ئێرانو ئەفغانستان بە ناوی دەستدرێژی نەکردن-عدم التعدی واژۆ کرا، لە ڕاستیدا ئەم پاکتە دەستپێشخەری تورکیای لە پێشەوە بوو، کە مەبەست تیایدا پێکهێنانی گلۆتێکی سیاسیی بوو لە ناوچەکەدا، بۆ ئەوەی لە کاتی جەنگو گەمارۆی سەربازیدا پشتی پێ ببەسترێت[3]. هاوڕێ لەگەڵ ئەمەداو لە سەروبەندی دەرکەوتنی سەرەتاکانی جەنگێکی نوێ لە جیهاندا، وڵاتانی بەشداربوو لەو پاکتەدا لەسەر ئەوە ڕێکەوتن سنوورەکانیان لە ڕوی ئاسایشو ئارامییەوە بێ کێشە بێت، لەمادەی ۷ی ئەم پاکتەدا هاتووە: "..... هاوپەیمانەکان بەڵێن دەدەن هەریەکەیان لەسەر سنووری خۆی ڕێگە لە دروستبونی تاقمی چەکدار یان کۆرو ڕێکخستن بگرێت کە بەمەبەستی هەڵگێڕانەوەی دامودەزگاکان دادەمەزرێنو ئاژاوە دروست دەکەنو ئاسایشی گشتی دەشڵەقێننو ڕژێمی حوکم دەشێوێنن. ئیتر لەهەربەشێك لەوڵاتانی هاوپەیمان، چ لەسەر سنوور یان لەهەر ناوچەیەکی تردا بێت"[4].

---

1 بڕوانە: دەقی ڕێکەوتننامەکە پاشکۆی ژمارە/۱ .

2 عبدالرزاق الحسني: تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الرابع، ل٢٦٨.

3 نصيف جاسم المطلبي: موقع تركيا الجيوستراتيجي وأهميته للعراق، ل٢٥٧.

4 دەقی ئەم مادەیە بەدەستکارییەوە وەرگیراوە لە: مەحموودی مەلا عزەت: بازنەکانی ململانێو ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەی کورد، چاپی دووەم، ۱۹۹۹، ل۹۰.

لەم سۆنگەیەوە ئەم خاڵە بە بڕوای مێژوونووسان[1] تایبەتە بە بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، چونکە ئەگەر سەیری جوگرافیای وڵاتانی بەشداربووی ئەم پاکتە بکەین، دەبینین چەقی پاکتەکە دەکەوێتە ناوەندی کوردستانەوە ئەگەر ئەفغانستانی لێ دەربکەین، کەواتە کوردستان ئەو سێگۆشەیەیە کە هەریەکە لە عێراقو تورکیاو ئێران بەیەك دەگەیەنێت. هەر بزاڤێکیش لەم ناوچەیەدا روبدات، ئەوا هەڕەشەیە بۆ سەر دامو دەزگا حکومییەکانو سیستەمی فەرمانڕەوایەتی وڵاتانی بەشدار بوو. لێرەدا پرسی کورد لە باشووری کوردستانو تەواوی پارچەکانی تردا، لە پەیوەندییەکانی نێوان عێراق-تورکیا، تورکیا-ئێران، ئێران-عێراق سەرکەوت بۆ ئاستی پەیوەندییە هەرێمییەکانو تاکە ئامانجیش بوو کە پاکتی سعد ئاباد دای بەدەستەوەو هەرئەمەشە خاڵی تایبەتمەندیی ئەم قۆناغە، کە هەریەك لە عێراقو تورکیاو هاوپەیمانەکانیان لە پاکتی سعد ئاباد دەگەنە ئەو رایەی کێشەی کورد لە ناویاندا دوولایەنە چارەسەر ناکرێت، بەڵکو گەلەکۆمەکێی هەرێمیی دەوێت.

دوا قۆناغەکانی پەیوەندیی نێوان تورکیاو عێراقی پاشایەتیو کاریگەریی لە باشووری کوردستاندا، لە دەرئەنجامەکانی دووەمین جەنگی جیهانەوە سەرچاوەی گرت، کە لە ٢٤/ئەیلول/١٩٤٦دا خۆی لە هێنانەکایەی کۆماری کوردستان لە مهابادا بینیەوە. هەر لە سەرەتای دامەزراندنی کۆماری کوردستانەوە، وڵاتە هەرێمییەکانی وەك عێراقو تورکیا، کۆماری کوردیان بە زەنگێکی ئاگادارکردنەوە دەزانیو بە سەرەتایەکیان دانا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی بنکەفراوان کە نەك بە تەنها نەخشەی ئێران، بەڵکو نەخشەی عێراقو تورکیاش دەگۆڕێ. هەرچی وڵاتانی وەك ئەمەریکاو بریتانیاش بوون،کە لە سەرەتای جەنگێکی نوێدا بوون لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتداو دواتر بە جەنگی سارد* ناسرا، ئەم کۆمارە کوردییەیان بە بنکەی سۆڤیەت دەزانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا[2]. لەم دیدەوە تورکیا لە ترسی کۆمارێکی کوردی بنکەفراوانی پشتبەستوو بە سۆڤیەت وەك یەکێك لە هۆکارەکان، خۆی لەگەڵ رۆژئاوا بە سەرکردایەتیی ئەمەریکا لە یەك بەرەدا رێکخست[3]. حکومەتی عێراق بەهەمان شێوە خۆی لەبەردەم هەڕەشەیەکی وادا بینیەوە، بۆیە لە نوێکردنەوەی رێکەوتننامەیەی تورکی-عێراقی لە ٢٩/مەی/١٩٤٦دا، واتە دوای دوو مانگ لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان،

---

1 جلیلی جلیل واخرون: الحركة الكردية، ل١٨٢-١٨٣.

* لەساڵی ١٩٤٥-١٩٩٠ وەك ململانێیەکی ئایدۆلۆجی بەبێ بەکارهێنانی چەك لەنێوان هەردوو بلۆکی سەرمایەداری بە سەرۆکایەتی ئەمریکاو سۆسیالستی بەسەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤیەت بەڕێوە چوو.

2 عثمان علي: دراسات فی الحركة الكردية، ل٧٢٧-٧٢٨.

3 احمد نوری النعیمی: السياسة الخارجية التركية بعد الحرب العالمية الثانية، دار الحرية، بغداد، ١٩٧٥، ل١٠٣.

ئەم دوو دەوڵەتە واژۆی ڕێکەوتنێکیان کرد، کە دەتوانرێت بەچڕوپڕترین ڕێکەوتننامە بناسرێت لە مێژووی پەیوەندییەکانی تورکیا- عێراقدا، کە زیاتر بۆ چارەسەری کێشەی ئاسایش لە نێوانیاندا تەرخان کرابوو، یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی ئەم ڕێکەوتنە ڕووداوەکانی کۆماری کوردستان بوو.

ڕێکەوتننامەکە لە سێ بەش پێکهاتبوو، بەشی یەکەم شەش پڕۆتۆکۆڵی لەخۆ گرتبوو کە بریتی بوون لە:

١. ڕێکخستنی ئاوی دیجلەو فرات.

٢. یارمەتی دوولایەنە لەڕوی ئاسایشەوە.

٣. یارمەتی ڕۆشنبیری‌و فیکری.

٤. یارمەتی گەیاندنی پۆستەو هێڵی تەلەفۆن.

٥. کاروباری ئابووری.

٦. کاروباری تایبەت بە سنوور.

بەشی دووەم تایبەت بوو بە هاوکاریی مەدەنی‌و دادوەری‌و بازرگانی، بەشی سێیەم بۆ گۆڕینەوەی تاوانباران تەرخان کرابوو[١] .

کۆماری کوردستان تێگەیشتنێکی نوێی بە هەریەك لە تورکیاو عێراق، لە ڕووی مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەی کورد، بەخشی. بۆ هەردوولا ڕوون بووەوە ئەم کۆمارە بۆ بزووتنەوەی کورد لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بۆتە سەرچاوەی مژدە بەخش[٢] ، لەم ڕوانگەیەوە تورکیا لای خۆیەوە بڕیاری ڕاگواستنی کوردی سەر سنوورەکانی عێراق-ئێرانی دا[٣] ، هەروەها حکومەتی عێراق، بە توندو تیژترین شێوە بەرەوڕووی ئەو کوردانەی باشووری کوردستان بۆوە کە لە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان لە ١٥/دیسەمبەر/١٩٤٦دا دەیانویست بگەڕێنەوە شوێن‌و جێگەی خۆیان، لەم بارەیەوە تورکیا تەواو هاوکاریی عێراقی کردو هەردوولا لە پاشەکشەی هێزی بارزانیەکان لە بەرامبەر سوپای ئێراندا، تەواوی هەوڵی سەربازی خۆیان خستەگەڕو نەیانهێشت ئەو چەکدارە کوردانە لە ناو سنووری عێراق یان تورکیا نیشتەجێ بن[٤] تاجارێکی ترو بزووتنەوەیەکی نوێ بە شێوازێکی نوێ لە سەر سنوورەکان نەهێننە کایەوە.

---

1 بڕوانەدەقی ڕێکەوتنەکە لە: عبدالرزاق الحسني: تاريخ الوزارات العراقيه، جزو٨، ل٥٥-٨٧.

2 روبرت اولسن: المسالة الكردية فى العلاقات التركية-الايرانية، ترجمة، محمد احسان، دار اراس للطباعة والنشر. اربيل، ٢٠٠١، ل٥٠.

3 جليل جليل واخرون، ل٢١١.

4 حامد محمود عيسى: المشكلة الكردية فى الشرق الاوسط، مكتب مدبولى، القاهرة، ١٩٢٠، ل١٩٤.

لێرەدا دەتوانین بڵێین عێراق‌و تورکیا ڕۆڵێکی سەرەکییان گێڕا بۆ ئاوێتەکردنی کێشەی کورد لەگەڵ جەنگی ساردا، ئەم دوو دەوڵەتە لە ٢٤/یەنایەر/١٩٥٥ دا، پاکتی هاریکاری ئاڵوگۆڕی- التعاون المتبادل یان واژۆ کرد، هەریەك لە بریتانیاو پاکستان‌و ئێران بە دوای یەکتریدا چوونە ناو ئەو پاکتەو ئەمەریکاش وەك ئەندامی چاودێر وەرگیرا[1] ، کە دواتر بە ناوی پاکتی بەغداد ناسراو بووە خاڵی بەیەك گەیاندنی هاوپەیمانی باکووری ئەتڵەسی NATO لەگەڵ هاوپەیمانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا SEATO ، تا هەرسێکیان لە ریزەوە ببنە شوورایەك لە بەردەم مەترسیی یەکێتیی سۆڤیەتدا[2] .

ڕۆڵی تورکیاو عێراق بۆ بە جیهانیکردنی کێشەی کورد وەك هۆکارێکی نائارامی لە ناوچەکەدا بە تایبەتی‌و لە جیهاندا بەگشتی لێرەوە دەردەکەوێت، لە ڕێکەوتننامەی ١٩٤٦ ی نێوان تورکیاو عێراق، لە پێشەکییەکەبدا نووسراوە، "ئاشتی‌و ئاسایشی نێوان ئەم دوو وڵاتە بەشێکە لە ئاشتی‌و ئاسایشی گەلانی جیهان‌و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست". هەمان ئەم بنەمایە بە شێوازێکی نوێ تورکیاو عێراق دەیخەنە نەخشەی کاری پاکتی بەغدادو لە مادەی پێنجدا هاتووە:

"ئەم پێنج حکومەتە جەخت لەسەر ئەو خواستە ئەکەنەوە کە هاوڕایە لەگەڵ مادەی ٥١ی گەلاڵەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان- بە شێوەیەکی یەکسان‌و بە یەك ئامانج کار بکەن، بە مەبەستی بەرقەرارکردنی ئاشتی‌و ئاسایش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، دژی هەر دەستدرێژی‌و کارێکی تێکدەرانە بەرگری لە وڵاتانی خۆیان بکەن‌و لەپێناوی خۆشگوزەرانی‌و ئاسوودەیی گەلانی ناوچەکە، دەستبەکار بن"[3]

بەشداربونی عێراق لە پاکتی بەغداد مایەی سەرسوڕمانی وڵاتە عەرەبییەکان بە گشتی‌و میسر بوو بە تایبەتی. میسر پرسیارێکی لای عیراق ورووژاند، کە بوونی عێراق لە هاوپەیمانی بەرەی ڕۆژئاوادا دژ بە بەرەی ڕۆژهەڵاتی کۆمۆنیستی چ پێویست دەکات؟ لە کاتێکدا عێراق هیچ سنوورێکی هاوبەشی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا نییە![4] .

حکومەتی عێراق زۆر بە ڕاشکاوانە، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا رایگەیاند کە سیاسەتی دەرەوەی لەسەر دوو بنەما بەندە، یەکەمیان خزمەتکردنی ئامانجە عەرەبییەکانە، کە لە

---

1 احمد نوري النعيمي: السياسة الخارجية التركية، ل٢١٧

2 ابراهيم خليل احمد واخرون: تركيا المعاصرة، مطبعة دارالكتب، موصل، ١٩٨٨، ل٢١٧.

3 احمد نوري نعيمي: السياسة الخارجية التركية، ل٣٤٧.

4 نصيف جاسم المطلبي: موقع تركيا الجيوستراتيجي، ل٢٧٣-٢٧٤" عبدالرازاق الحسني: تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثامن، ل٢٢٢.

ڕێگەی هاریکاری لەگەڵ وڵاتە عەرەبییەکان دێتە دی، دووەمیان پاراستنی ئاسایشی عێراقە، لەڕێگەی ڕێکخستنو چەسپاندنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیاو ئێرانداو سەبارەت بە جۆری پەیوەندییەکانی عێراق بە تورکیاوە بەم جۆرە پێناسەی دەکات: "دەوڵەتە عەرەبییەکان ئاگادارن کە تورکیا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دراوسێمانەو بە سنوورێکی بەرینو سروشتێکی جوگرافی هاوشێوەی وەك یەك، هاوبەشی عێراقە"[1]، بەم جۆرە عێراق زۆر بەڕوونی لە وتاری سیاسیی خۆیدا ئەوە پیشان دەدات تورکیاو عێراق سنوورێکی هاوبەش لە نێوانیاندایە، هەرچەندە عێراق ناوی شێوەو جۆری ئەو سروشتە نابات، بەڵام وەك ئاشکرایە ئەم سروشتە هاوبەشە ڕوویەکی مرۆیی هەیە کە نەتەوەی کوردە، ڕووەکەی تریشی سروشتییە کە خاکی کوردستانە، کەواتە وەك ئەنجامی کۆتایی هاوکێشەیەکی سیاسیی، دەتوانین بڵێین پاراستنی سروشتی هاوبەشی نێوان تورکیاو عێراق، بەشێکە لە زامنکردنی ئاسایشی عێراقو یەکێکە لەو دوو بنەمایەی کە سیاسەتی عێراقییان لەسەر بەندە.

لەم خاڵەوە ئەوەمان دەستگیر دەبێت کە ڕاستە عێراق سنووری سیاسیی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا نییە، بەڵام سنوورێکی سروشتی لەگەڵدا هەیە، ئەویش باشووری کوردستانە باکووری عێراق کە دانیشتوانەکەی پەیوەندییەکی هاونەتەوەییو هاونیشتمانی لەگەڵ باکووری کوردستان باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیاو ڕۆژهەڵاتی کوردستان، باکووری ڕۆژئاوای ئێراندا هەیەو ئەم دوو ناوچەیە هاوسنووری یەکێتیی سۆڤیەت بوون لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. کەواتە نەتەوەی کورد تاکە کارتی دەستی عێراق بوو بۆ بەشداریکردن لەگەڵ تورکیاو هاوپەیمانەکانی لە پاکتی بەغدادا[2].

1 عبدالرازاق الحسني: تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثامن، ل٢٢٣-٢٢٤.

2 فليب روبنس: تركيا والشرق الاوسط، ترجمة: ميخائيل نجم خوري، مكتبة مدبولي، قاهرة، ١٩٩٣، ل٣٤-٣٥.

## تەوەرەی دووەم:

# پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان تورکیاو کۆماری عێراق و کاریگەریان لەسەر باشووری کوردستان

## ١٩٥٨- ١٩٧٥

پەیوەندییەکانی نێوان عێراق‌و تورکیا لە ماوەی ١٩٥٨-١٩٧٥ لە ئاستێکدا نەوەستاون، بەڵکو بەهێزی‌و لاوازییان تێکەوتووە، ئەمەش بۆ ئەو گۆڕانکارییە سیاسییانە دەگەڕێتەوە کە لە ئاستی ناوخۆیی‌و سیاسەتی دەرەوەی هەریەك لەو وڵاتانە رەنگیان داوەتەوە. لەم ماوەیەداو لە ساڵانی ١٩٥٨،١٩٦٣،١٩٦٨ لە عێراقدا سێ کودەتای سەربازی ئەنجام دراون[1]، بەهەمان شێوە تورکیاش لە ساڵی ١٩٦٠،١٩٧١ دوو کودەتای بەخۆوە بینیوە[2]، هەریەك لە سەرانی کودەتاچییەکان کاتێك دەسەڵاتیان وەرگرت خاوەنی بیروبۆچوونی نوێ بوون، هەر بۆیە شێوازێکی نوێ لە سیاسەتی دەرەوەدا پیادە کراوە، بە تایبەت بەرامبەر کێشەی کورد لە باشووری کوردستان.

خاڵی وەرچەرخان لە پەیوەندییەکانی نێوان عێراق-تورکیا لە ١٤/یۆلیو/١٩٥٨ دەستپێدەکات، کاتێك بە کۆدەتایەکی سەربازی رژێمی پاشایەتی عێراق کۆتایی پێهات‌و رژێمی کۆماری بە سەرکردایەتیی عەبدولکەریم قاسم ١٩٥٨-١٩٦٣ پێکهات، کە لە مێژوی عێراقدا ئەم رووداوە بە شۆڕشی ١٤/تەموز/١٩٥٨ ناوبانگی دەرکردووە. ئەمە رووداوێکی کتوپڕبوو بۆ جیهان بە گشتی‌و هاوپەیمانەکانی عێراقی پاشایەتی بە تایبەتی، چونکە سەرلەبەیانیی ١٤/ یولیۆ تەواوی خێزانی پاشایەتی لە عێراقدا لەناوبران، ئەمە لە کاتێکدا کە هەمان رۆژ ئەندامانی پەیمانی بەغداد چاوەڕێی گەیشتنی شاندی باڵای عێراق بوون بۆ ئەنقەرە تا کۆبوونەوە لەسەر ئاستێکی بەرز ببەستن، وا بڕیار بوو بەشداربووانی

---

1 بۆزانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالوهاب حمید رشید، العراق المعاصر، دار المدنی، دمشق٢٠٠٣. ل١٧٥-١٣٨

2 بۆزانیاری زیاتر بڕوانە: نویاز هوفسبیان واخرون: تورکیا بین صفوة البیروقراطیة وحکم العسکری، الابحاث العربیة، بیروت، ١٩٨٥، ل٢٠٣-٢٤٥.

دەوڵەتی عێراقیش هەریەك لە مەلیك فەیسەڵی دووەم‌و نوری سەعید بێت[1] . هەر لەبەر ئەمەیە رۆژی کودەتاکە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەبێتە کێشەیەکی ناوچەیی‌و نێودەولەتیی، ئەندامانی پەیمانی بەغداد لە یاداشتنامەیەکدا ئەو رووداوە دەبەستنەوە بە ململانێکانی جەنگی ساردو بە جۆرێك وەسفی دەکەن "کارێکی روخێنەرەو لە دەرەوە هاتووە، سەرکردەی کودەتاچییەکانیش بۆچوونەکانیان زادەی دەوڵەتێکی بێگانەیە"[2]، هەمان رۆژ تورکیا لای خۆیەوە رایگەیاند کە: "سەرانی سەرکێشیکاری سیاسیی لە عێراقدا، لە پشت ئەم کودەتایەوە خوازیاری لە ناوبردنی پاکتی بەغدادن کە بەسەرچاوەی ئاشتی دادەنرێت لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستداو گەورەترین بەلگەی ئەم راستیەش رۆژی جێبەجێکردنی کودەتاکەیە کە رێکەوتی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی پەیمانەکەیە"[3] .

لەم دوو وتارەوە دەکرێت دووخاڵ بخەینە بەرچاو،یەکەمیان هەلۆیستی ولاتانی رۆژئاواو ئەندامانی پەیمانی بەغداد دەخاتە روو، کە کودەتای ١٤/یۆلیۆ بە کارێك دادەنێن لە رووی مەعنەوی‌و مادییەوە لەلایەن دەوڵەتێکی بێگانەوە پشتگیری لێکراوەو بە ئاشکرا مەبەستیان لەو دەوڵەتە یەکێتیی سۆڤیەت بوو کە لەوباوەڕدا بوون یارمەتی کودەتاچییەکانی دابوو، بەتایبەتی کاتێك زانییان سەرانی کودەتاکە مەیلی بیری کۆمۆنیستانەیان هەیە. خالێکی تر کەمایەی سەرنجە، هەلۆیستی تورکیا بوو کە عێراقی کۆماری بە دژی پاکتی بەغداد تۆمەتبار کرد، ئەو پەیمانەی دژی شالاوی کۆمۆنیستی‌و هەر چالاکییەك بوو کە قەیرانی سیاسیی بۆحکومەتەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست دروست بکات. لەم دیدگایەوە تورکیا دەیڕوانیە داهاتووی عێراق، پێی وابوو عێراقی نوێ رژێمێکی کۆمۆنیستی دەبێت‌و باشووری کوردستانیش لەبەردەم پێناسێکی نوێدایەو ئەگەری ئەوەی لێ دەکرێت ببێتە مایەی شلۆقی ناوچەکە.لێرەوە تورکیا لە ١٧/یۆلیو/١٩٥٨ رایگەیاند تورکیا دان بەحکومەتی عێراقدا نانێت، زیاتر لەوەش پلانێکی سەربازی دادەڕێژێت بە چوونە ناوەوەی سوپایی لە باشووری کوردستانەوە بۆ ناو خاکی عێراق بۆ گێڕانەوەی رژێمی پاشایەتی لە عێراق، تورکیا بە مەبەستی پشتگیریکردنی پیلانەکەی دەستیکرد بە هاوپەیمان کۆکردنەوە، سەرەتا ئەمەریکاو بریتانیای لێ ئاگادار کردەوە، بەلام هەریەك لەم دوو دەوڵەتە لەبەر جەماوەری بوونی کودەتاکە ئەم بیرۆکەیان رەتکردەوە، سەرەڕای سلەمینەوەیان لە کاردانەوەی هەلۆیستی

---

1 سیامەند کریم محمد: ترکیا والقضایا العربیة ١٩٤٥ -١٩٦٧، معهد التأریخ العربي والتراث العلمي رسالة ماجستر غیر منشورة، بغداد، ٢٠٠٤، ل٨٠-٨١.

2 احمد نوری النعیمی: سیاسة الخارجیة الترکیة، ل/٢٥٩.

3 احمد نوری النعیمی: سیاسة الخارجیة الترکیة، ل٢٥٩.

یەکێتیی سۆڤیەت، چونکە ئەگەری هەڵایسانی شەڕێکی گەرمی لێدەکرا، بۆهەمان مەبەست ئەندامانی پەیمانی بەغداد لە ڕۆژهەڵاتدا لەم پلانە ئاگادار کرانەوە، ئەمانیش هەمان هەڵوێستیان هەبوو. ئەمە وایکرد تورکیا پاشەکشە لە جێبەجێکردنی پەیمانەکە بکات، بە تایبەت بە هۆی ئەو فشارانەی لەلایەن یەکێتیی سۆڤیەتەوە بەرەو رووی کرایەوە[1].

بەڕای ئێمە یەکێکی تر لە هۆکاری هەڵوێست گۆڕینی تورکیا، مامەڵەی کوردی باشووری کوردستان بوو لە بەرامبەر عێراقی کۆماریدا، چونکە هەر لەیەك دوو رۆژی یەکەمدا پ.د.ك و جەماوەری کوردی بە گەرمی پێشوازییان لە کۆماری عێراق کردو پشتگیریی خۆیان بۆ دەربڕی[2]، ئەمە لەمێژووی عێراقدا یەکەم جار بوو کورد بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە خۆی بە عێراقی بناسێنێت، لێرەدا تورکیا ئەوەی لاگەڵاڵە بوو کوردی باشووری کوردستان لە سنووری عێراقدا ئۆقرەیان گرتووەو رژێمی کۆمارییان لاپەسەندەو هەڵوێستی جوداخوازییان نییە لەبەر هەموو ئەمانە تورکیا بە ناچاری لە ٣٠ی یۆلیۆی١٩٥٨ دا رایگەیاند کە دان بە رژێمی نوێی عێراقیدا دەنێت بەو هیوایەی عێراق لە پەیمانی بەغدادا بمێنێتەوە[3].

لەگەڵ ئەم بڕیارە نوێیەدا تورکیا لە رووداوەکانی عێراق خەم سارد نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆر بە وریاییەوە بەدواداچوونی سات بە ساتی رەوشی ژیانی سیاسیی عێراقو باشووری کوردستانی دەکرد، بە تایبەت کە چەندین گۆڕانکاری بەخۆوە بینی لە گرنگترینیان دەستووری نوێی ٢٦/یۆلیۆ/١٩٥٨ بوو کە لە مادەی ٣دا هاتووە "کۆمەڵگەی عێراقی لەسەر بنەمای رێزگرتن لە مافو ئازادی بەندە، ئەم گەلە عەرەبو کوردی لەخۆ گرتووەو لە چوارچێوەی یەکێتیی عێراقدا دەستوور زامنی ئازادییە نیشتمانییەکانیان دەبێت"[4]، ئەم مادەیە مایەی شۆکی هەریەك لەئێرانو تورکیا بوو، چونکە یەکێك لەو دەوڵەتە ناوچەیانەی کوردستانییان بەسەردا دابەش کراوە بە بێ پرسو راوێژی دەوڵەتانی دراوسێ، دانینا بە بوونو مافی کورد دا[5].

---

1 سیامند کریم حمود: ترکیا والقضایا العربیة، ل٨١-٨٤.

2 سعد ناجی جواد: العراق والمسألة الکردیة ١٩٨٥-١٩٧٠، دارالالام، لندن، ١٩٩٠، ل٣٥-٣٦.

3 ابراهیم خلیل واخرون، ل٢٢٧.

4 حامد محمود عیسی: المشکلة الکوردیة في الشرق الأوسط، ل١٥٨.

5 سعد ناجی جواد: العراق والمسألة الکردیة، ل٣٧.

ئەوەی جارێکی تر تورکیای نیگەران کردو بە رەسمی عێراقی لێ ئاگادار کردەوە، مستەفا بارزانی[1] بوو کە لە ٦/ ئۆکتۆبەر/١٩٥٨ لە یەکێتیی سۆڤیەت بۆ عێراق گەڕایەوە، تورکیا هۆشداری بە عێراق دا، گەڕانەوەی ئەم سەرکردە کوردە ئەگەری سەرهەڵدانو هەڵگەڕانەوەی نوێی لێدەکرێت[2] .

هەموو ئەمانە خاڵی گرژی پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو عێراق بوون، بەڵام ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکان لەئەنجامی چەند رووداوێك بوو، لەوانە لەیادی ساڵڕۆژی راگەیاندنی سیستەمی کۆماری عێراق لە کەرکوك لە رۆژی ١٤/یولیو/١٩٥٩دا، پێکداپژانی تورکمانو کوردو عەرەبو کۆمەنیستەکانی لێ کەوتەوەو لە ئەنجامدا ٣١ تورکمان گیانیان لەدەستدا[3] رۆژنامە تورکییەکان زۆر بە چڕوپڕی دەستیانکرد بە پڕوپاگەندە کردن کە تورکمانی کەرکوك مەترسی نەمانیان لەسەرە[4] ، هەر لەم بارەیەوە نوێنەرێکی ئەنجومەنی نیشتمانی گەورەی تورکیا، نارسیم نەرین، وتی: "کوردەکان براکانی ئێمەیان کوشت، ئێمەش دەبێت چەند تورکمان کوژراون، ئەوەندە کورد بکوژینەوە"، لەبەر ئەوە ٤٩ کەس لە رۆشنبیرو ناودارانی کورد لە تورکیا دەستگیر کرانو بڕیاربوو لە سێدارە بدرێن، کە تۆمەتی جوداخوازیو دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیان خرایە پاڵ، بەڵام لەبەر رای گشتی جیهانیو کاردانەوەی لەسەر گەشەکردنی جوڵانەوەی نەتەوەیی کوردی بڕیارەکە راگیرا[5] .

خاڵێکی تر کە پەیوەندییەکانی نێوان عێراقو تورکیای ئاڵۆز کرد بریتی بوو لەوەی عێراق لە ٢٤/مارت/١٩٥٩ لە پەیمانی بەغداد کشایەوە، ئەمەش تورکیای وەك هاوپەیمانێك لە بەرامبەر عێراقی کۆماری بێ ئومێد کرد، لەگەڵ ئەوەی نوێنەری عێراق لە ئەنقەرە رایگەیاند "پەیوەندیی بەشێوەی ئاسایی لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا بەردەوام دەبێت، وەك ئەوەی لە پێش پەیمانی بەغدادا هەبووە"، بەڵام تورکیا بەم بڕیارەی عێراق هاوپەیمانێکی بەهێزی لە ناوچەکەدا لە دەستداو ستراتیژیەتی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا کەلێنی تێکەوت، کە پێویست بوو بە شێوازێکی نوێ بە پیریەوە بچێتو تاك لایەنانە خۆی بەرپرسیار بکات لەو

---

1 لە ساڵی ١٩٠٢ لەدایك بووە، لە ١٩٤٣-١٩٤٥ سەرکردایەتیی راپەرینی ناوچەی بارزانی کردووە، بەشداری لە سوپای کۆماری کوردستان ١٩٤٦-١٩٤٧ کردووە. پاشان ئاوارەی یەکێتیی سۆڤیەت بووە ١٩٥٨ ، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە لە دامەزراندنی پارتەکە ١٩٤٦ تاکۆچی دوای کردووەلە ١٩٧٩ .

2 نصیف جاسم المطلبی: موقع ترکیا الجیو ستراتیجی واهمیته، ل٢٨١.

3 عزیز قادر الصامانجي: التاریخ السیاسی لترکمان العراق: دار الساقی، بیروت، ١٩٩٩، ل١٧٠.

4 نصیف جاسم المطلبي: موقع ترکیا الجیو ستراتیجی واهمیته، ل٢٨١.

5 دیڤد ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕانی، ئەبوبەکر خۆشناو چاپی دووەم چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٦٦٠.

کێشانەی لەوەوپێش لەگەڵ هاوپەیمانە عێراقییەکەیدا بڕیاریان دابوو لە سنووری پەیماننامەی بەغدادا چارەسەری بکەن، ئەوە بوو وەك سیاسەتێکی کاتی بۆ هێورکردنەوەی هەستی نەتەوایەتیی کوردەکانی تورکیا، چەند کۆسپێکی لە بەردەم بەکارهێنانی زمانی کوردی بە شێوەیەکی نافەرمی هەڵگرت[1].

لە ۲۷/مایو/۱۹٦۰دا یەکەم کودەتای سەربازی لە تورکیادا ئەنجامدراو بەدوای خۆیدا کێشە ناوخۆییەکانی تورکیا روویان لە ئاڵۆزی کرد، وەك کێشەی قەیرانە ئابوریەکان و تیرۆرو سەرهەڵدانی رەوتی کۆمۆنیستیو ئیسلامی[2]، لێرەوە تورکیا نەیدەتوانی وەك پێشتر چاودێری بارودۆخی باشووری کوردستان بکات، بە تایبەتی لەم ماوەیەدا شۆڕشی ئەیلول ۱۹٦۱-۱۹۷۵ لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستان ەوە بە سەرکردایەتیی مستەفا بارزانی دژی تاکڕەوی رژێمی کۆماریو پێشێلکاری مافەکانی کورد لە عێراق رێبەرایەتی دەکرا[3].

لێرەوە شوێنو پێگەی شۆڕش زەنگێکی ئاگادارکردنەوە بوو بۆ تورکیاو ئێران، کە هەستی نەتەوایەتیی کوردی بە زیندوویی ماوەتەوەو بەرگرتن یان یارمەتیدانی ئەو راپەڕینە واتای گواستنەوەی چالاکی کوردە بۆ بەشەکانی تری کوردستان[4]، لە سەرەتای دەست پێکردنی شۆڕشەوە تا ۱۹۷۵، چەکدارەکانی کورد کە بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان ناسرابوون، زۆرینەی سنووری تورکیا-عێراق یان گرتەدەست[5]. لای خۆیەوە حکومەتی تورکیا تەواوی سنووری خۆی بەڕوویاندا داخست، ئەمە لەکاتێکدا سنووری ئاوەڵا بوو بۆ ئەو هۆزانەی لە ململانێی خێڵایەتی لەگەڵ بارزانییەکان بەڕووی سنووری تورکیادا هەڵهاتبوون[6]، لەناوخۆدا تورکیا بۆ هەر دۆخێکی کتوپڕی لەناکاوی کوردەکان ئامادەباشی تەواوی کرد، جگە لەمە سەرەك کۆماری تورکیا جەمال گورسیل ۱۹٦۱-۱۹٦٦، هەڕەشەی لە کوردی تورکیا کرد کە "ئەگەر تورکە کێوییەکان هێمنی رانەگرن، ئەوا سوپا هیچ دەست لەبۆمبارانکردنی گوندو

---

1 عبدالفتاح علی یحی البوتانی: وثائق عن الحرکة القومیة الکردیة التحرریة، وزارة التربیة، اربیل، ۲۰۰۱، ل٧٤.

2 فیروز أحمد: صنع ترکیا الحدیثة، ترجمة: سلیمان داود الواسطي وزمیله، بیت الحکمة، بغداد، ۲۰۰۰، ل۲۷۲.

3 گۆیننەر دێشنەر: کورد گەلی لەخشتەبراوی غەدر لێکراو، و: حەمە کەریم عارف، بلاوکراوەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ۲۰۰٤، ل۲۲۳-۲۲٥.

4 سعد ناجي جواد: العراق والمسألة، ل۱۸۱.

5 مسعود البارزاني:البارزاني والحرکة التحرریة الکردیة، ثورة أیلول ۱۹٦۱-۱۹۷٥، الجزء الثالث، مطبعة وزارة التربیة أربیل، ۲۰۰۲، ل۳۹.

6 کریس کۆچیرا: کورد لەسەدەی نۆزدەو بیستدا، وەرگێڕانی حەمە عارف کەریم، چاپخانەو ئۆفسێتی شڤان، ۲۰۰۳، ل٤٦٧.

شارەکانیان ناپارێزێتو لەگەڵ زەوی تەختیان دەکاتو خۆشیان لەخەڵتانی خوێن هەڵدەکێشێت ولاتیان لێدەکات بەگۆمی خوێن"[1].

سەرباری ئەم هەڕەشانە، خێڵە سنووریەکانی عێراق-تورکیا وەك خێڵی گۆیان، دۆسکی، قشوریە، ئۆرما، بە چەكو چەکدارو یارمەتی مادی هاوکاریی شۆڕشی کوردیان کرد، لەم بارەیەوە نوێنەری عێراق لە ئەنقەرە نیگەرانی خۆی بۆ ئەم کارە دەربریو داوای لە تورکیا کرد بەربگرن لەم یارمەتییانە[2]، (دانا ئادەمز شمدس) هەمان ئەو زانیارییانە پشتڕاست دەکاتەوە کە گەلێك چەکی بڕنەو لە دیوی تورکیاوە بە دەست شۆڕش گەیشتوون[3].

تورکیا لە چالاکی سوپای عێراقی لەسەر سنووری تورکیا- عێراق دژ بە شۆڕشی کورد ناڕازی بوو، بەلام بە باشی دەزانی ئەو چالاکییانە بەردەوام بن تا شۆڕشەکە لەناودەچێت بە مەرجێك سنووری نێوان دوو دەوڵەتەکە پارێزراو بێتو سوپای عێراق چالاکییەکانی سنووردار بن. بە درێژایی ١٩٦١ و ناوەڕاستی ١٩٦٢ حکومەتی تورکیا بێدەنگی خۆی نواند، تا لە ١٥/ئۆگستۆس/١٩٦٢ دا فڕۆکە عێراقیەکان بە هەڵە پێگەیەکی تورکیایان پێکا بوو، دوو پۆلیسی سنووری تورکیا کوژران، لە بەرامبەردا تورکیا بۆ رۆژی دوایی بە بیانووی سنوور بەزاندن فڕۆکەیەکی عێراقی خستە خوارەوە، دوای ئەم رووداوە تورکیا نوێنەری خۆی لە عێراق کێشایەوە، بەلام کاتێك تورکیا ئەو هەوالانەی بۆ پشتڕاست بووەوە کە کورد بۆ گواستنەوەی چەكو یارمەتیی سەربازی بە شۆڕشەکەیان سنووری تورکیا بەکار دەهێنن، بۆیەو بۆ بەرگرتن لەم کارانە تورکیا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ عێراقدا ئاسایی کردەوە[4].

لە ٨/ فبرایەر/١٩٦٣دا کودەتای سەربازی عەرەبە نەتەوەییەکان بە سەرکردایەتیی عەبدولسەلام عارف ١٩٦٣-١٩٦٦ ئەنجامدراو کۆتایی بە حوکمی عەبدولکەریم قاسم هێنرا، تورکیاش هەرزوو دانپێدانانی خۆی بۆ حکومەتی نوێ راگەیاند[5]، چونکە سەرانی کودەتاکە لە ناوەندی سیاسیدا بە بیری ناسیۆنالستی عەرەبی توندڕەوی دژە کۆمۆنیستی ناسرابوون کە ئەمە مایەی خۆشحاڵیی تورکیا بوو، لەبەر ئەوەی کودەتاچییەکان توندو تیژ بوون بە تایبەت لە بەرامبەر کورددا، هاوکات لەگەڵ رەوتی کۆمۆنیستی عێراقی ناکۆك بوون

---

1 کەنداڵو ئەوانی تر: گەلێکی بەژمووردەو نیشتمانێکی بەرت، سوید،١٩٩٨، ل١٥٤.

2 عبدالفتاح علي يحى البوتاني، وثائق عن الحركة ، ل٧٥.

3 دانا ادمز شمدث: رحلة إلى الرجال الشجعان في كردستان، ترجمة: جرجيس فتح لله، دار اراس، اربيل، ١٩٩٩، ل٩٦.

4 ادمون غريب: الحركة القومية الكردية، ل٦٤.

5 ابراهيم خليل وأخرون: تورکيا المعاصرة. ل٢٢٦.

که ئەمەش عێراقی لە بلۆکی سەرمایەداری رۆژئاواو پەیمانی ناتۆ نزیکتر دەکردەوە کە تورکیا تیایدا ئەندام بوو.

عیراق بە مەبەستی کۆتایی هێنان بە شۆڕشی کورد پیلانێکی بە ناوی پلانی دیجلە دارشت، کەئەم پیلانە هاوشێوەی پاکتی سەعد ئابادو بەغداد هاوکاریی تورکیاو سوریاو ئێرانی پێویست بوو، وەزیری دەرەوەی عێراق تالب شبیب نوێنەری ئەم دەوڵەتانەی لە بەغداد لە پیلانەکە ئاگادار کردەوەو هەرسێ لایەنی تورکی- ئێرانی- عێراقی رێکەوتنیان لەسەرکردو وەزیری بەرگری عێراقی سەرپەرشتیی پیلانەکەی کرد، هەروەها دوو ئەفسەری پەیوەندیدار بە پلەی عەقید لە تورکیاو ئێران گەیشتنە باشووری کوردستانو پەیوەندییان بە فرۆکەی وڵاتەکانیان دەکرد کە لە ئاسمانی عێراقدا دەفڕینو بنکە سەربازییەکانی خۆیانیان لەسەر سنوور لە وردو درشتی ئۆپەراسیۆنی سوپای عێراق بۆ سەر شۆڕشی کورد ئاگادار دەکردەوە [1] .هاوکات عێراقو تورکیا بۆ لاواز کردنی ریزی ناوخۆی شۆڕشی کورد، دەستیانکرد بە فریودانی ئەو خێڵانەی دوژمنایەتییان هەیە لەگەڵ بارزانیەکانو هانیاندان بۆ پشتگرتن لە پێشمەرگە لەکاتی هێرشی سوپای عێراقیدا، لەلایەکی تریشەوە ویستیان ئەم چەکدارانە بکەنە لەمپەرێك لەبەردەم هاوکاریی کوردی باکوور بۆ باشووری کوردستان[2] .

چەند هۆکارێك لەپشت دەست تێوەردانی تورکیا لە باشووری کوردستانو بەپیرەوە چوونی پیلانی عێراق بۆ لە ناوبردنی شۆڕشی کوردەوە هەبوون، یەکێکیان ئەوە بوو لەئەنجامی ئەو شەپۆلی نەتەوایەتیەی لە باشووری کوردستانەوە بەرەو باکوور هەڵدەکشا، توێژی دەستەبژێری کورد لە تورکیا، دەیانویست بە وێنەی کورد لە باشوور، لە دەستووری نوێی ساڵی ١٩٦١دا بوونی نەتەوەیی خۆیان لە تورکیا بسەلمێننو مافی هاووڵاتی لە تورکیادا بۆ کورد بەدەست بهێنێنن[3] ، لەلایەکی دیکەشەوە بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد لە باشووری کوردستان لای تورکیا ئەو بزووتنەوەیە بوو کە سەرەڕای ئەوەی سیما سەرەکییەکەی کوردانەیە، هاوکات بەهۆی کەسێتی مستەفا بارزانی کە لە یەکێتیی سۆڤیەت گەڕابۆوەو هەروەها شێوەی پرۆگرامی پارتی دیموکراتی کوردستان کە بەرواڵەت کۆمۆنیستی بوو، تایبەتمەندییەکی وای بەم بزووتنەوەیە بەخشیبوو کە لەلایەن یەکێتیی سۆڤیەتەوە پشگیری دەکرێت، سەرباری ئەمانە روانگەیەکی تری تورکیا بۆ بزووتنەوەکە، پەیوەندییە خۆرسکییەکانی شۆڕشی کورد

1 علی کریم سعید: عراق ٨ شباط١٩٦٣- من حوار المفاهیم الی حوار الدم، مراجعات فی ذاکرة طالب شبیب، دمشق، ١٩٩٩، ل٢٥٧-٢٥٨.

2 عبدالفتاح علی البوتانی: الحرکة القومیة الکردیة التحرریة، دار سبریز، دهوك، ٢٠٠٤، ل٣٥٣.

3 صلاح سعد الله: المسألة الکریة فی ترکیا، مرحلة جدیدة، مطبعة شفق، بغداد، ١٩٩١، ل٣٦-٣٧.

بوو لەگەڵ باکووری کوردستان[1] ، ئەمە مەترسییەك بوو تورکیا هەر لەیەکەم رۆژی دامەزراندنیەوە ترسی لیّ هەبوو کە بەدوری نەدەزانی سەرکردەی ئەم شۆڕشە مەلا مستەفای بارزانی وەك لە ناوەکەیدا تایبەتمەندیی ئایینی و خێڵەکی پێوە دیارە، بە وێنەی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران ١٩٢٥ هەڕەشەی گەورەبێت بۆ سەر رژێمی عەلمانیەتی تورکیا[2] .

ئەم هۆکارانە بەردەوام تورکیایان هان ئەدا کە چالاکیی کورد لە تورکیا و عێراق کپ بکات، بەڵام ئەوەی بووە بەربەست لەبەردەم ئەم پیلانەدا سۆڤیەت بوو، کاتێك زانی کە دەوڵەتانی ناوچەکە هاریکاری عێراق دەکەن بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد، بە تایبەت سوریا کە بەشێك لە سوپاکەی بەشداری راستەوخۆی لەگەڵ سوپای عێراق دەکرد لە بەرەنگاربوونەوەی شۆڕشەکەدا، ئەمە هۆکاری سەرەکی بوو کە یەکێتیی سۆڤیەت تورکیاو ئێرانو سوریا لە دەستخستنە ناو کاروباری باشووری کوردستان ئاگادار بکاتەوە، هەروەها رایگەیاند دەستێوەردانی هەر هێزێکی ناوچەیی لەڕووی سەربازییەوە بۆ باشووری کوردستان، دەرئەنجامی سیاسیی خراپی دەبێتو چەندین دەوڵەت بەر هەڕەشە دەکەون لەوانە یەکێتیی سۆڤیەت[3]. ئەمە پەیامێکی سۆڤیەتی بوو کە تورکیاو ئێرانی ئاگادار کرد، عێراقی کۆماری دوای ئەوەی لە پاکتی بەغداد پاشەکشەی کردووە، بە هیچ شێوەیەك وابەستەی هاوپەیمانیەتی ناوچەیی نویّ نییە، بۆیە دەستوەردانی وڵاتانی سەنتۆ* لە کاروباری وڵاتێکی تر کە ئەندام نییە لە سەنتۆدا کارێکی مەترسیدارە[4] .

لێرەدا دەکرێت بڵێین تورکیا لەدوای ئەم هەڕەشەیەی یەکێتیی سۆڤیەتو لەبەر ئەوەی خۆی نەکاتە میدانێکی جەنگ لە نێوان بلۆکی رۆژئاواو رۆژهەڵات، راستەوخۆ دەستی لە کاروباری باشووری کوردستانو شۆڕشی کورد کێشایەوە، بەڵکو تەنها کارێك کردی سەرکوتکردنی کوردی ناوخۆی تورکیاو بەهێزکردنی سنوورەکانی بوو بە رووی شۆڕشی

---

1 عبدالفتاح علی یحی البوتانی: وثائق عن الحرکة، ل٧٤.

2 تورکیا ئەم شۆڕشەی لەناو برد بە بیانوی ئەوەی دژی رژێمی عەلمانیەتی تورکیایە و مۆرکی ئاینی و خێلکی پێوە دیارەو ئامانجی گەڕندنەوەی تورکیایە بۆ رژێمی سەڵتەنەتی عوسمانی، هەر بۆیە ئەم شۆڕشەی کردە بەهانە بۆ نەهێشتنی هەموو تایبەتمەندیەکی کوردی، ئاینی، خێڵەکی لە وڵاتدا.

3 ادمون غریب: الحرکە القومیە الکردیە، ل٨٠-٨١.

* لەدوای دەرچونی عێراق لە پاکتی بەغداد، ناوی گۆڕا بەپەیمانی سەنتۆ Cento و بنکەکەشی گواسرایەوە بۆ تورکیا.

4 سۆڤیەت ویستی بۆشەرعیەتدان بە کارەکەی مەنگۆلیای هاوپەیمانی رابسپێرێت، بۆ ئەوەی لەدانیشتنی ئەنجومەنی ئاسایشدا دەستێوەردانی وڵاتانی دراوسێ لەکوشتنی کوردی باشووری کوردستان مەحکوم بکەن، بەڵام نارەزایی وڵاتە عەرەبیەکان وایکرد سۆڤیەت دەست لەم داوایانەی هەڵبگرێت لەبەر پاراستنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی لەگەڵ رژێمی نوێیی وڵاتە عەرەبیەکان ٤ . کریس کۆچێرا: کورد لەسەدەی نۆزدەو بیستدا، ل٣١٠-٣١١.

وردیدا، ئەمەش ئەنجامێکی کاریگەری جەنگی سارد بوو لەسەر پەیوەندییە سیاسییەکانی
ێوان تورکیاو عێراقو کاردانەوەی لەسەر باشووری کوردستان.
گەڵ بەردەوامبوونی ئامادەباشی حکومەتی تورکیا لە ناوچە کوردیەکان، کوردی تورکیا لە
رمەتیدانی شۆڕشی کوردی باشوور درێخیان نەکرد، ڕۆژنامەی (NewYork Times)ی
ەمەریکی لە ٢٥/یەنایرو ١/فیبرایر/١٩٦٦ بلاویکردەوە کوردەکانی تورکیا بە شێوەیەکی
چاخ چەك لە ئەوروپای ڕۆژهەلاتەوە دەگەیەننە دەست شۆڕشگێڕانی کورد لە عێراق[1]
اوکات دەستەبژێری کوردی تورکیا لەو کاتەدا ڕۆلێکی بەرچاویان هەبوو لە ریزی چەپی
ڕکیداو ریزەکانی پارتی کرێکارانی تورکیا کە لە ساڵی ١٩٦١ دامەزرابوو، دەستیان
ڕدبوو بە هەلمەتێکی ڕۆشنبیری لە ڕێی پەخشو بلاوکراوە بە زمانی کوردیو بە پیتی
ێینی[2]، لەگەڵ ئەوەی ئەم توێژە نوێیە بە ڕاستەوخۆو ئاشکرا، پەیوەندییان نەبووە لەگەڵ
ۆڕشی کوردی باشوور، بەلام تورکیا ئەو چالاکییەی کوردی تورکیای کردۆتە ماڵ بەسەر
ڕدی عێراقەوەو ڕۆژنامەنووسێکی تورك دەلێت تەواوی داواکاری کوردی تورکیا،
وستکردنی دەولەتێکی لەپشتەوەیەو مستەفا بارزانی هاندەریانە[3] .
لەڕاستیدا تورکیا لەم بارەیەوە هەلە نەبوو، بۆ نموونە پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا
لە ساڵی ١٩٦٥ بە نهێنی دامەزرا لەژێر تینوتاوی پ.د.ك. دروست بوو[4]، ئەمەی
وەمیان بە شێوەیەکی بەرچاو بەشداری دەکات لە ململانێی ناوخۆی پارتی دیموکراتی
ڕدستانی تورکیا کە تیایدا هەریەك لە رابەرانی ئەو پارتە سەعید ئالچیو دکتۆر شڤان
یدا کوژران[5] .

پەیوەندییەکانی نێوان عێراقو تورکیا لەدوای کودەتای بەعسییەکان لە ١٩٦٨،
وازێکی تریان بەخۆوەبینی، حزبی بەعسی سۆسیالیستی عەرەب کە ئەنجامدەری کودەتاکە
، پرۆژەی جیاوازی هەبوو سەبارەت بەکێشە ناوخۆییەکانی عێراق لەوانە کێشەی
ڕد،ئەوە بوو لە ١١/مارت/١٩٧٠دا بە فەرمی ڕەزامەندی لەسەر ئۆتۆنۆمی بۆ کوردی
ڕاق دەربڕی. ئەم ڕووداوە کاریگەریەکی زۆری لەسەر تورکیا هەبوو، ئەوە بوو لە ئاستی

---

[1] سعد ناجي جواد: العراق والمسألة، ل/١٨١.

[2] جليلي جليل واخرون: الحركة الكردية، ل/256-257.

[3] عبدالفتاح علي يحى البوتاني: وثائق عن الحركة، ل/٧٥.

[4] مارتن ڤان برونەسن: ئاغاو شیخ و دەولەت، وەرگێڕانی، کوردۆ، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ...انی، ١٩٩٩ ل/٦٠-٦١.

[5] مسعود البارزاني: البارزاني والحركة التحريرية، الجزء الثالث، ل/٣٥٩-٣٦٠.

ناوخۆدا رۆژنامەی ئەقشام ی تورکی راپۆرتێکی چڕوپڕی بە وێنەوە بە ناوی فایلی کوردی کە ماوەی زیاتر لە مانگێك درێژەی هەبوو بڵاوکردەوە، هەروەها پارتی کرێکارانی تورکیا لە کۆنگرەی دیسەمبەر/١٩٧٠دا چەند بڕیارێکی گرنگی سەبارەت بە کورد پەسەند کرد، لەوانە دانی نا بەوەدا، کە گەلی کورد بوونیان لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیادا هەیە، لەگەڵ پەسەندکردنی مافی یەکسانی هاوڵاتیبوونی کورد لەناو تورکیادا[١]. لە ئاستی دەرەوەشدا کۆنگرەی جیهانی بۆ هێزەکانی ئاشتی- المؤتمر العالمی لقوی السلم، کە لە ٣١/ئۆکتۆبەر/١٩٧٣ لە مۆسکۆ بەسترا، کە بەگەورەترین کۆنگرەی بزووتنەوەی رزگاریخوازەکان ناسراو تیایدا ١٢٠ رێکخراوی نێودەوڵەتییو ١١٠٠ رێکخراوو بزووتنەوەی ١٣٣ دەوڵەت تێدا بەشدار بوون، لە راپۆرتی کۆتاییدا سەبارەت بە بەیانی ١١/مارت/١٩٧٠، ئەم دەقەی لەخۆگرتبوو "کۆنگرە ئەم بەیانە بەبایەخدار دەزانێتو بەنمونەیەکی باشی دەزانێت کە وڵاتانی ناوچەکە لەناویاندا تورکیا پەیڕەوی بکەن"[٢].

بەڵام لە ئاستی حکومەتدا تورکیا لە بەرامبەر ئەم پێشکەوتنە سیاسییەی کێشەی کوردی باشووری کوردستانو لە ترسی رەنگدانەوەی لەسەر باکووری کوردستان دەستیکرد بە فراوانکردنو چڕکردنی چالاکییەکانی هێزی کۆماندۆس، کە هێزێکی نوێ بوو لە ناوچە کوردیەکانداو کاریان ئەوە بوو دەستیان بەسەر دێکاندا دەگرت بە تۆمەتی جوداخوازی ئازارو ئەشکەنجەی گیانیو زیانی مادیان بە کوردی تورکیا دەگەیاند، لەناو خەڵکی ئاساییدا، ئەم کردەوانەی سوپای تورك بە قڕەکورد ناوی دەرکرد[٣]. لە سیاسەتی دەرەکیشدا، پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەرکردایەتیی رژێمی عێراق بەتین کردو پێشوازی کرد لە سەرۆکی دەوڵەتی عێراق ئەحمەد حەسەن بەکر ١٩٦٨-١٩٧٩ و جێگرەکەی صدام حسێن لە ساڵانی ١٩٧٣و ١٩٧٤ و تەوەرەی کێشەی کورد باسێکی سەرەکی نێوان سەرانی دەسەڵاتداری تورکیاو عێراق بوو، هەروەها تورکیا خۆی کردە یەکەم پێگەی بەیەك گەیشتنی سەرانی ئێران- عێراق[٤] بۆ لەناوبردنی شۆرشی کورد[٥]. ئەم پەیوەندییەی نێوان عێراق و تورکیا، لایەنی یەکەمی بێگومان کرد لەوەی کە سنووری تورکیا بە رووی شۆرشی کورد داخراوەو هیچ یارمەتییەکی لە کەناڵی تورکییەوە دەسگیر نابێت، لێرەوە عێراق دڵنیا بوو سنووری تورکیا بە رووی

---

1 صلاح سعد الله: المسألة الکرية فی ترکیا، ل/٢٩.

2 هەمان سەرچاوە، ل/٢٧.

3 کەندال نەزانو ئەوانی تر: گەلێکی پەژموردە، ل/١٧٠.

4 ئەم دوو دەوڵەتە لەدوای ساڵی ١٩٥٨ لە ململانێیەکی توندا بوون، لە نێوانیشدا شۆرشی کوردی لەسەر پەتی ئەو ململانێیە یاری دەکرد.

5 کریس کۆچێرا: کورد لەسەدەی نۆزدەو بیستدا، ل/٤١٥.

شۆڕشدا داخراوەو تاکە دەرچەیەك کە ئەم بزووتنەوەیە هەیبێت ئێرانە، ئەویش لە ڕێکەوتننامەی جەزائیری ١٩٧٥دا لەگەڵ ئێراندا ڕێککەوتو ئەم سنوورەش بە ڕووی کوردا داخراو شۆڕشی ئەیلول لە ١٩٧٥دا بە پێی ڕێکەوتننامەی جەزائر[1] کۆتایی پێهێنرا[2] .

هەرچی پەیوەندیی شۆڕشی کوردە لەگەڵ تورکیا، مەسعود بارزانی بەم شێوەیە، لێی دواوە: "لەگەڵ ئەوەی سنووری نێودوڵەتی نێوان عێراق و تورکیا لە ڕۆژئاواوە، کە لە زاخۆ دەست پێ دەکات بۆ سیدەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە، لەساڵی ١٩٦٢ بەدواوە لەژێر دەستی سوپای شۆڕشگێڕی کوردستاندا بووە، بەڵام ئێمە بەکارمان نەهێناوە دژی حکومەتی تورکیا، ئەویش لەلای خۆیەوە هیچ هەوڵێکی نەداوە بۆ دۆزینەوەی پەیوەندیی لەگەڵ شۆڕشی کوردا، هەروەها بەدەستی ئەنقەست زیانی بەشۆڕش نەگەیاندووە."[3]

---

1 ئەم ڕێکەوتنە لە نێوان جێگری سەرۆك کۆماری عێراق سەدام حسین و شای ئێران موحەمەد ڕەزا شا ١٩٤١-١٩٧٩ ، لە جەزائر بەسترا، کەناوەرۆکەکەی بریتی بوو لەوەی کە ئێران دەستبگرێتەوە لە پشگیری کردنی شۆڕشی کورد لە بەرامبەردا عێراق بەشێکی خۆی لە کەنداوی فارسی ببەخشێت بە ئێران؛ نادر ئینتسار: ئیتنۆ نەتەوایەتیی کورد، وەرگێڕانی: عەتا قەرەداغی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل/١٦٨-١٦٩.

2 سەروەر عبدولرحمان: یەکێتی نیشتمانیی کوردستان ١٩٧٥-١٩٧٦ دامەزراوەو دروستکردنەوەی شۆڕش، سەنتەری چاپو پەخشی نما.٢٠٠٢ ، ل/٤٨-٤٩.

3 مسعود البارزاني: البارزاني والحركة التحررية، الجزء الثالث، ل/٣٧٣.

# تەوەرەی سێیەم
# پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و تورکیاو کاریگەرییان لەسەر باشووری کوردستان
# ١٩٧٥-١٩٩٠

پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان عێراقو تورکیا لە ١٩٧٥ بەدواوە، لە ژێر کاریگەری کۆمەڵێك رووداوی سیاسیی، شێوازی جۆراو جۆرو نوێیان بەخۆوە بینی، لەم نێوەندەدا باشووری کوردستان، سەرەکیترین پێگەی لەباری پەیوەندییەکانی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بوو.

حکومەتی عێراق لە دوای رێکەوتننامەی جەزائیر ١٩٧٥، لە باشووری کوردستان دەستی بە جێبەجێکردنی زنجیرە پرۆژەیەکی تایبەتی کرد کە تا سەرەتای یەکەم جەنگی کەنداو١٩٨٠-١٩٨٨ بەردەوام بوو. ئامانج لەمەدا دانانی رێوشوێنێکی نوێ بوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراقدا، کە دوورونزیك کاریکردە سەر شێوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیادا، ئەم پرۆژەیە بریتی بوو لە:

١. گۆڕینی پێکهاتەی دانیشتوانی کوردستان.

٢. پیکهێنانی پشتێنەی ئەمنی لە ناوچە سنووریەکانی عێراق لەگەڵ هەریەك لە تورکیاو ئێران.

٣. بەرگرتن لە بەردەم سەرهەڵدانەوەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی.

٤. باسکردنی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی کە هاوشێوەی عێراق کێشەی کوردیان هەیە[1].

حکومەتی عێراق بۆ گۆڕینی پێکهاتەی دانیشتوان لەباشووری کوردستان، دەستی بە راگواستنی ٢٠٠-٧٠٠ هەزار کورد کرد بۆ ناوچەکانی ناوەڕاستو خوارووی عێراق، پاشان سنووری پارێزگا کوردییەکانی گۆڕی، هاوڕێ لەگەڵ ئەم کارەیدا، بۆ پێکهێنانی پشتێنەی ئەمنی بە ناوی پشتێنەی عەرەبی، گوندە سنوورییە کوردییەکانی لە ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٩ داگرت بە درێژای ٦٠٠ میلو بە قووڵایی ٥-١٥ میل کە زیاتر لە ١٢٠٠ گوندی، شان بەشانی سنووری شاخاویی باشووری کوردستان. لەگەڵ تورکیاو ئێران رووخاندو دانیشتوانەکەی لە ئۆردووگا نزیك دەستەکانی سوپای عێراقی نیشتەجێ کرد، حکومەتی

---

1 جليلي جليل واخرون: الحركة الكردية، ل/٢٩٧.

عێراق بەو مەبەستە ئەو کارەی کرد کە هەموو جۆرە پەیوەندییەکانی کۆمەڵگەی کوردی لە باشووری کوردستان، لەگەڵ کۆمەڵگەی کوردی لە تورکیاو ئێران دابڕێت[1] .

بەشێکی دی لە پرۆژەکەی عێراق قۆرخکردنو سەرنگومکردنی دواجارەکی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد بوو لە کوردستاندا، بە تایبەت لە ۱۹۷۵-۱۹۸۰ گۆڕەپانی سیاسیی لە باشووری کوردستان گرووپو کۆمەڵەو پارتی نوێی لە خۆگرت، بەڵام بەهێزیو توندوتیژی دەوڵەتی عێراقی لە بەرامبەر لاوازیو بێدەرامەتیی مادیو مرۆیی، هۆکارگەلێك بوون کە وایانکرد ئەم بزووتنەوەیە ناوچە سنوورییەکانی عێراق-تورکیا، عێراق-ئێران بکەنە مۆڵگەو پێگەی سەرەکییان.

یەکەمین پارتێك دوای رێکەوتننامەی جەزائیر دروستبوو، ی.ن.ك بوو کە لە ۱/یۆنیۆ/۱۹۷۵ دا وەك پارتێکی نەتەوایەتی چەپ یەکەم بەیاننامەی لە سوریا دەرکرد، کاری ئەم پارتە ئاراستەیەکی ستوونی، لەناو کوردستاندا لەخۆ گرتبوو، بۆ دووبارە نوێکردنەوەی گیانی بەرگری نەتەوایەتی لەدوای نسکۆی شۆڕشی کورد لە ۱۹۷۵، ئاستێکی تری، ئاسۆیی بوو کە مەبەستیان هاریکاری هێزە چەپەکانی باشووری کوردستانو پارچەکانی ترو هەموو رێکخراوو دەوڵەتە سۆسیالیستەکانی جیهانو دژایەتی کردنی حکومەتی عێراق بوو، هاوکات دژایەتیی خۆی بۆ ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە وێنەی تورکیاو ئێران دەربڕی[2] . گرفتی ئەم پارتە بریتی بوو لە شێوەی گەیاندنی کادرو چەکداری لە سوریاوە بۆ ناوچەی سۆران واتە شوێنی ئەو کوردانەی بە کرمانجی خوارو دەدوێن، ی.ن.ك. لەم بارەیەوە سوودی لە کۆمەڵەی فەرهەنگیو دیموکراتی شۆڕشگێڕ د.د.ك.د، ۱۹۷٤ وەرگرت، کە شێوازی خەباتکردن لە کوردستاندا کۆی کردبوونەوە[3]، بەهۆی ئەندامەکانی د د ك د سنووری عێراق- تورکیا و زۆرجار ناو خاکی تورکیایان بە کاردەهێنا بۆ گواستنەوەی ئەندامانی سەرکردایەتییو چەك بۆ ناوچەی سۆران[4] .

---

1 کەندال نەزانو ئەوانی تر: گەلێکی بەژموردە، ل/۳۳۷.

2 سەروەر عبدولرحمان: ی. ن. ك نیشتمانیی کوردستان، ل/۲۳۲-۲۳٤.

3 نەوشیروان مستەفا ئەمین: لەکەناری دانووبەوە بۆخڕی ناوزەنگ، ل/۱٦۲-۱٦۳، کریس کۆچیرا: بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کوردو هیوای سەربەخۆبوون، بەرگی دووەم، ل/۱٤٦.

4 نەوشیران مستەفا ئەمین: لەکەناری دانوبەوە بۆخڕی ناوزەنگ، ل/۷۸.

له بەرامبەر یەکێتیدا، پ.د.ك، بە ناوی سەرکردایەتیی کاتی سالّی ١٩٧٦ دا دووبارە خۆی رێکخستەوەو کەوتە خۆسازدان بۆ کارکردن[1]، بەلاّم گرفتی ئەم پارتە بە وێنەی ی.ن.ك لە خۆناسین بە کۆمەلّگەی کوردی نەبوو، ئەم بە هۆی مێژوی کۆنی پارتەکە، بە شێوەیەکی گشتی لە ناو کوردستاندا ناسراو بوون، لێرەدا گرفتی لەوەدا بوو کە بە هۆی رێکەوتننامەی جەزائیر،دەولّەتی ئێران پابەندی کردبوو بەوەی نابێت چالاکییەکانیان لە سنووری ئێرانەوە دژ بەعێراق دەست پێبکاتەوە، لەم سونگەیەوەو بە پشت بەستن بە بنکەی جەماوەری لە ناو کوردی تورکیا، بنکەو بارەگاکانی لە ناو باکووری کوردستان دامەزراندو ئاراستەی چالاکییەکانیشی رووەو باشووری کوردستان لە ناوچەی بادینان دەست پێدەکرد[2].

لەم بارودۆخەدا بەرەی چالاکییە سنووریەکانی نێوان ی.ن.ك و پ.د.ك لە سەر سنوورو ناوخاکی تورکیادا، بەر یەك کەوتن‌و خالّی ململانێی نێوانیان لەسەر پێگەو شوێنی دەسەلاّت لێرەوە دەستی پێ کرد، تورکیا لەم ململانێیەدا لایەنگری پارتی دیموکراتی کوردستان ی کرد، چونکە ئەم پارتە بەهۆی مێژوی چەندین سالّەی خەباتی، دەرکەوتبوو چالاکییەکانی تەنها لە سنووری باشووری کوردستاندا بووە، هیچ هەلّوێستێکی دیارو بەرچاوی دژی تورکیا نەنواند بوو[3] بە پێچەوانەی ی.ن.ك کە لە یەکەم رۆژی راگەیاندنیدا،بە ئاشکرا دژایەتی بۆ تورکیا دەربڕیوەو دەستی هاریکاریکردنی بۆ هێزە کوردییە چەکدارەکانی باکووری کوردستان درێژ کرد بوو[4]، تورکیا لە یارمەتی د. د. ك. د. بۆ ی.ن.ك ئاگادار بووە، هەموو ئەمانە تورکیایان بۆ دژایەتی ی.ن.ك وەك هێزێکی چەپی نەتەوەیی لەباشووری کوردستان هان داو هەولّی دا هاوکاریی ئایۆلۆژیو چالاکی سیاسیی نێوان کوردی تورکیاو عێراق لەڕێگەی دووبەرەکییەوە لاواز بکات. بەلاّم ئەم مامڵە نوێیەی تورکیا لە بەرامبەر بزووتنەوەی کوردی لەوێوە سەرچاوەی گرتبوو کە دەولّەت سەرقالّی کێشە ناوخۆییەکانی بوو، وەك کێشەی ململانێی راستڕەو چەپڕەو لە ناوەندی دەسەلاّتدا، هەروەها دیاردەی تیرۆری هەڕەمەکی[5]، کە وایان کردبوو تورکیا وەك پێویست سنوورەکانی بە رووی بزووتنەوەی کوردی لە باشووری کوردستان کۆنترۆلّ نەکات.

---

1 بڕوانە دەقی بەیاننامەی سەرکردایەتیی کاتی: نەوشیروان مستەفا ئەمین: لەکەناری دانوبەوە بۆخڕی ناوزەنگ، دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق، چاپی دووەم چاپخانەی زانکۆی سلیمانی،١٩٧٧، ل/٤٤٠-٤٤١.

2 دیڤد ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل/٥٦٥-٥٦٦.

3 بڕوانە تەوەرەی دووەم کۆتا پەڕە.

4 بڕوانە بەیاننامەی ی ن ك ، نەوشیروان مستەفا: لەکەناری دانوبەوە بۆخڕی ناوزەنگ، ل/١٦٠.

5 فیروز احمد: فیروز أحمد: صنع ترکیا الحدیثە، ل/٣٦٩-٤٠٥.

لەم روانگەیەوە، خاکی تورکیا دەبێتە گەورەترین خاڵی پێکدادانی نێوان ی.ن.ك و پ د ك، بەتایبەت لە ١٩٧٨ دا، کاتێك هێزێکی ١٠٠٠ کەسی ی.ن.ك بە سەرکردایەتیی عەلی عەسکەری و خالد سەعید بە ناو خاکی تورکیادا، بۆ بەدەستهێنانی چەك بەرەو سوریا دەچوون، لە نزیك شاری هەکاری کوردستانی باکوور، لە لایەن سەرکردایەتیی کاتی، بۆسەیان بۆ دانراوەو تووشی شکستێکی گەورە هاتن و هەردوو سەرکردەی هێزەکەی تێدا کوژران[1] .

ئەگەرچی ململانێی پارتە کوردییەکان لەو کاتەدا، زیانێکی گەورە بوو بۆ بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کوردی، بەڵام بەدیوێکی تردا بەڵگەی خۆ رێکخستنەوەی ئەم بزووتنەوەیە بوو، کە توانیبویان گرفتە ناوخۆییە تورکییەکان بقۆزنەوەو سوود لەو بارودۆخە ناهەموارە وەربگرن کە تورکیا پێیدا تێپەری دەکرد.لەبەر ئەمە دەکرێت بڵێین بەگەڕکەوتنەوەی بزووتنەوەی کوردی گورو تینێکی بە بەر پەیوەندییەکانی تورکیا- عێراق دا کردەوە، کە خودی ئەم جۆرە پەیوەندییانە بەشێك بوو لە سیاسەتی عێراق لە باشووری کوردستان، بە جۆرێك عێراق دەیخواست هاوپەیمانە کۆنەکانی کە هاودەنگییەکی نەگۆڕیان لەپاکتەکانی سەعدئاباد و بەغداد سەبارەت بەکێشەی کورد نواندووە، بەشێوازێکی نوێ زیندوو بکاتەوە.

تورکیا پێشوازیی لەپرۆژەی نوێی عێراقی کرد، لەبەرئەوەی ئەم پرۆژەیە لەگەڵ پرۆژە ئابوریەکانی تەریب بوو، لە ١٩٧٦دا رێکەوتنێکی ئابووری لەنێوان تورکیاو عێراق بەسترا[2] کە لەناوەرۆکدا، هەردوو لا لەسەرناردنە دەرەوەی نەوتی عێراق بەناو خاکی تورکیا بۆ سەر دەریای ناوەڕاستو لەرێگەی لوولە نەوتییەکان رێکەوتن[3]، دووساڵ دواتر لە ١٩٧٨ سەرەك کۆماری عێراق ئەحمەد حەسەن بەکر، لە ئەنقەرە رێکەوتنێکی دیکەی لەگەڵ تورکیادا واژۆ کرد، تیایدا باس لەنەهێشتنی هەر جۆرە گرفتو لەمپەرێك لە بەردەم رێکەوتنی ١٩٧٦ دا کرا بوو[4] . لەناو ئەو گرفتانەش، کێشەی کورد بوو کە لەمادەی ٤ دا هەماهەنگی هەردوولا بۆ دژایەتیکردنی بەپێویست زانرا[5]، هەر لەم جۆرە رێکەوتنە لە ساڵی ١٩٧٩دا سەرۆك ئەرکانی تورکیا کەنعان ئیڤرین رێکەوتنێکی سەربازی لەگەڵ عێراق واژۆ کرد. لە سەرو

---

1 نەشیروان مستەفا ئەمین: لەکەناری دانوبەوە بۆخڕی ناوزەنگ، ل/٢٧٧-٢٩٥، دیڤد ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل/٥٦٦-٥٦٧.

2 ابراهیم خلیل احمد واخرون: ترکیا المعاصر، ل/٢٢٧.

3 فلیب روبنسن: ترکیا والشرق الاوسط، ل/٧٧.

4 ابراهیم خلیل واخرون: ترکیا المعاصر، ل/٢٢٧.

5 جلیل خلیل واخرون: الحرکة الکردیة فی العصر الحدیث، ل/٣٠٠.

بەندی ئەم جموجۆڵەو ڕێکەوتنە دیپلۆماسییانەی نێوان عێراق‌و تورکیادا، دەتوانین بڵێین ئەگەر کێشەی کورد لە ١٩٢٦-١٩٧٦ پەیوەندیی بە ئاشتی‌و ئاسایشی هەردوو دەوڵەتی تورکیاو عێراقەوە بوو بێت، ئەوا لەرێکەوتنی ١٩٧٦ بە دواوە کێشەی کورد پەیوەندیی بە زامنکردنی بەرژەوەندییە ئابورییە باڵاکانی ئەم دوو دەوڵەتەوە هەبوو، بە مانایەکی تر کێشەی کورد لە باشووری کوردستان بۆ هەریەك لە عێراق و تورکیا لە پرسێکی سیاسیەوە بەرەو کێشەیەکی سیاسیی‌و ئابووری هەنگاوی هەڵگرت‌و هەردوولا ئەو تێگەیشتنەیان بۆ پەیدا بوو کە هەڕەشەی کورد ئەگەر سەرکوت نەکرێت ئەوا جگەلە ئاسایشی نەتەوەی، زیان لە بڕبڕەی ئابووری هەردوو دەوڵەت دەدات[1].

لە بەرامبەر ئەم جۆرە ڕێکەوتنانەی نێوان تورکیاو عێراق، گەلێك ڕووداوی نوێی لەناکاو کاریان لەسەر جۆری پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو عێراق کرد، لەوانە ڕووخانی ڕژێمی شاهانەی محمد رەزا شا١٩٤١-١٩٧٩ لە ١٢/فەبرایر/١٩٧٩ وەك هاوپەیمانێکی ڕۆژئاواو جێگرتنەوەی ڕژێمێکی ئیسلامی بە ڕابەرایەتی ئایەتوڵڵا خومەینی ١٩٧٩-١٩٨٨، هەروەها دەست پێکردنی جەنگی کەنداوی نێوان عێراق‌و ئێران لە ٢٢/ سێپتەمبەر/١٩٨٠دا کە بووە هۆی ئەوەی ئاستی ستراتیژی تورکیا، وەك تاکە دەوڵەتی بەهێز لە ناوچەکە، بۆ وڵاتانی ڕۆژئاواو ئەمەریکا بەرز ببێتەوە، لیرەدا کودەتای ١٢/سێپتەمبەر/١٩٨٠[2] تورکیا شێوە سەقامگیرییەکی سیاسیی لەناوخۆو دەرەوەدا، بە تورکیا بەخشی‌و وای کرد کە لە ئاستی داواکراوی ڕۆژئاوادا بێت[3].

لەم جەنگەدا باشووری کوردستان،پێگەیەکی ستراتیژی پەیدا کرد، بۆ عێراق‌و ئێران وەك دوو دەوڵەتی شەڕکەر، هەروەها بۆ تورکیا وەك دەوڵەتێك کە سنوورەکەی لە باشووری کوردستاندا لەگەڵ هەردوو دەوڵەتی شەڕکەر عێراق،ئێران دا بەریەك دەکەوتن.

باشووری کوردستان لەماوەیەکی کەمدا بۆ هەریەك لە تورکیاو عێراق، لە یەکەمین جەنگی کەنداودا ١٩٨٠-١٩٨٨ بوو بەناوچەیەکی مەترسیدار، ئەمەش بەهۆی:

---

1 جرجيس حسن: تركيا استراتيجية الامريكية بعد سقوط الشاه، بدون مكان طبع، ١٩٩٠، ص٩٥.

2 ئەم کودەتایە لەسەر دەستی سەرەك ئەرکانی تورکیا کەنعان ئڤرین کرا، هۆکارەکانی وەك لە یەکەم بەیانی سەربازیدا ڕاگەیەنرا" دەوڵەت و دامو دەزگاکانی لە کارکردندا دەسەوسان ڕاوەستاون، پارتە سیاسەییەکان لەرووی کۆدەنگییان لەسەر چارەسەرکردنی کێشەکانی وڵات لاوازن، لە ئەنجامدا گرووپە جوداخوازەکان چالاك بوون،کۆنە پەرستەکانیش زیاتر گەشەیان کردووە" ، نوبار هوفسبيان واخرون، ل/٢٠٣.

3 جرجيس حسن: تركيا في الاستراتيجية الامريكية بعد سقوط الشاه، ل/٤٥-٥٨.

١. سنووری ڕۆژهەڵاتی باشووری کوردستان، کە بەشێکی گەورەی سنووری ڕۆژهەڵاتی عێراق‌و بەرەیەکی گەرمی شەڕەکە بوو، دۆخێکی لەباری پێك هێنا بۆ بزووتنەوەی کورد لە باشووری کوردستان، بە جۆرێك ئەم بزوتنەوەیە لە ڕووی چەك وچەکدارو بنکەی جەماوەری بەهێز بوو، کە ئەنجامەکەی بە شێوەیەك بوو هێزی شەڕکەری پارتە کوردییەکان کەبە پێشمەرگە ناسرا بوون، توانییان گەلێك ناوچە سنووریەکانی عێراق لەگەڵ تورکیاو ئێران بگرنە دەست، ئەمە بۆ خۆی خاڵی ڕەخنە گرتنی تورکیا بوو لە عێراق، کە عێراق کۆنترۆڵی ناوچە سنووریەکانی لەدەستداوە[1] .

٢. بەهێزبوونی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد لە باشووری کوردستان، تەریب بوو لەگەڵ پەیدابوونی چالاکیی چەکداریی پارتە کوردییەکانی تورکیا، کە ئەمەش مایەی مەترسی بوو بۆ تورکیا، بەتایبەت کاتێك لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٠دا سوپای تورکیا دەستی بەسەر بنکەیەکی گروپی کاوە دا گرت کە گرووپێکی چەپڕەوو شۆڕشگێڕ بوون‌و، جگە لە چەك‌و تەقەمەنی، چەندین بڵاوکراوەو پلان‌و نەخشەی دەستکەوت باسیان لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە کوردستانی گەورەدا دەکرد[2] .

٣. سوپای عێراق بەتەواوی خۆی یەکالا کرد بۆوە بۆ بەهێزکردنی سنوورەکەی بە ڕووی سوپای ئێراندا، ئەمە هۆکار بوو کە هێزی عێراق لە سنوورەکانی لەگەڵ تورکیادا نەتوانێت بەر بەچالاکی پێشمەرگەی پارتە کوردییەکان بگرێت‌و هێزی کوردی لەم نێوەندەدا توانی ئەو ناوچەیە بەکار بهێنێت نەك تەنها بۆ پێشمەرگەکانی باشووری کوردستان، بەڵکو کردی بە بنکەیەك بۆ خۆسازدانی پارتی کرێکارانی کوردستان PKK، کە لەو کاتەدا وەك پارتێکی کوردستانی باکوور لە قۆناغی گواستنەوەدا بوو لە نهێنییەوە بۆ ئاشکرا، مەسعود بارزانی لە ١٩٨١دا ڕێکەوتنێکی لەگەڵ عەبدوڵلا ئوچ ئالان واژۆ کرد، بەو پێیە هەردوولا خەبات لە دژی دوژمنی هاوبەش بکەن کە تورکیاو عێراقە[3] . ئەنجامی هەموو ئەم هۆکارانە عێراق‌و تورکیا لە ئەنقەرە لە ١٩٨٢ ڕێکەوتنێکیان بە ناوی ڕاوەدوونانی گەرم ، المطاردة الساخنة واژۆکرد کە تیایدا هاتبوو:

١. ڕێگە بە هێزی سەربازی هەردوولا دەدرێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کە زیاتر نەبێت لە ٣ ڕۆژ بە قووڵایی ١٧ کیلۆ مەتر بچنە ناو خاکی یەکدیەوە.

---

1 روبرت ولسن: المسألة الكردية، ل/٤٨.

2 ابراهيم داقوقي: اكراد تركيا، دار المدى، دمشق، ٢٠٠٣، ل/٢٠٨.

3 روبرت ولسن: المسألة الكردية، ل/٤٨.

٢. بەمەبەستی لەناوبردنی کاری کۆمۆنیستیو بیرو چالاکی روخێنەرو تێکدەرانەو کاری سنوور بەزاندن، هەردوولا هاوکارییو هەماهەنگی ئەمنیو زانیاری گۆڕینەوە لە نێوانیاندا دژی ئەو کەسانە دەکەن کە بەو کارانەی پێشو هەڵدەستن.

٣. بەدەستەوەدانی تاوانباران‌و رێگەدان بە دادگا ئاسایشەکان بۆ بەدواداچونی کەسانی تاوانبار لە خاکی یەکتریدا.

٤. عێراق بڕی تێچونی هەموو جوڵەیەکی سەبازی تورکی لە ناو خاکی خۆیدا لە ئەستۆ دەگرێت[1].

بە تێڕوانین بۆ ئەم رێکەوتنە دەبینین تەواو بە قازانجی تورکیا لاسەنگە، چونکە بەهۆی ئەوەی عێراق لە بارودۆخێکی شەڕدا بوو، بەزاندنی سنووری تورکی لەلایەن عێراقەوە ئەگەرێکی لاواز بوو، لە کاتێکدا کشانی سوپای تورك بۆ ناو خاکی عێراق، بەهۆی بوونی هەرەشەی کوردی لە باشووری کوردستانەوە، هەمیشە لە ئانوساتدا بوو، سەرەڕای ئەمە لە خاڵی چوارەمی رێکەوتنەکەدا بە ئاشکرا دیارە عێراق سازشی لەبەردەم تورکیا کردووەو رێگەی بۆ خۆش کردووە سنوورەکەی ببەزێنێت، بە بێ ئەوەی هیچ ئەرکێکی مادی لەسەر تورکیا بکەوێت. عێراق بەم کارەی بە فەرمی چارەسەری مەلەفی کوردیو بەرگرتن لە بە هێزبوونی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەسنووری لەگەڵ تورکیا، دەداتە دەست سوپای تورکیا.

هاوکاریی عێراق-تورکیا زۆری نەبرد لە ١٩٨٣دا لەچوارچێوەی رێکەوتنێکەوە گواسترایەوە بۆ مەیدانی پراکتیکی، ئەمەش چەند پاڵنەرێکی هەبوو، لەوانە مۆرکردنی بەیاننامەی تەرابلوس لە نێوان ئۆپۆزسیۆنی عێراقیدا کە تیایدا بەهێزترین گرووپ لەڕووی چەکدارییەوە هێزە کوردیەکان بوون، لەم کۆنگرەیەدا بڕیار لەسەر کارکردن لە پێناو رووخاندنی رژێمی عێراق بە پشتبەستن بە دەوڵەتە عەرەبییەکانی وەك سوریاو لیبیا درا[2]. لە لایەکی تریشەوە سوپای ئێران لە هەمان سال بە چاوساغیو پێشرەوی پێشمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ناوچەی حاجی ئۆمەرانەوە بۆ ناو قولایی باشووری کوردستان هێرشی دەستی پێکرد[3] سەرباری ئەمە تورکیا زانیاریی پەیدا کرد کە پارتی کرێکارانی کوردستان، ئەندامەکانی لە سوریاوە رەوانەی سەر سنووری عێراق-تورکیا دەکات بۆ ئەوەی ئامادەبن لەناو تورکیادا گورزی خۆیان بوەشێنن، بەم جۆرە بەرژەوەندی هاوبەشی تورکیاو

1 جرجس حسن: تركيا في الاستراتيجية الامريكية بعد سقوط الشاه، ل/٦٦، جليلي جليل واخرون: الحركة الكردية، ل/٣٠٤.

2 حامد محمود عيسى: المشكلة الكردية، ل/٢٧١.

3 میدڵ ئیس ۆچ: جینۆساید لەعێراق، ل/٨٥.

عێراق له باکوورو باشوور بەرامبەر وەستان لـه دژی ئێرانوسوریا لـه ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئـاوا، باشووری کوردستانیش بوو بەچەقی پیکدادانی بەرژەوەندییـە دژەکـان، هاوکـات تورکیـا لـه لایەن ڕۆژئاواوە ڕێگەی پێ درابوو لە کاتی مەترسی دەست بەسەردا گرتنـی سـوپای ئێرانـی بۆ کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوکو مووسڵ، ئەو ناوچـانە لـە مەترسـی بپارێزێـتو کـۆنترۆڵی بکات[1] . ئەمانە هۆکارگەلێك بوون له٢٦٠-٢٨/ مایۆ/١٩٨٣ سوپای تـورکی لـه ژێـر نـاوی ئێکسپریس ٨٣ و بە ناوی دەستگرتن بەسەر چالاکیی جوداخوازەکان، بە قووڵای ٢٥ میـل سنووری عێراقی بەزاند[2] و چەندین پێشمەرگەی کوشت[3] .

هاتنە ناوەوەی سوپای تورکی بۆ ناو باشووری کوردستان گەلێك پاشماوەی سەلبی لەسەر ناوچەکە بەجێهێشت کە ئەمانە بوون:

١. تورکیا بە فەرمی دەستی لەباشووری کوردستان کرایەوەو بەو ئاواتە گەیشت کە لە سەرەتای دروستبونی دەوڵەتی عێراقییەوە پلانی بۆ دادەنا، ئەوە بوو تا ١٩٨٧ سێ جاری تر بە هەمان شێوە سنووری بەزاند[4] .

٢. کارتی کوردی لە یەکەمین جـەنگی کەنـداوداا تێکـەڵ بـە کـارتی نـەوت بـوو، لێـرە بەدواوە بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کـوردی لـە باشـووری کوردسـتان لـە لایـەن هاوپەیمانـەکانی تورکیاوە کە ڕۆژئاواو ناتۆ بوون، وەك هاوپەیمانێکی ئێران دەبینرانو هەر نزیـك بوونەوەیـەکی هێزی کوردی لە کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوك، تورکیای سەرپشك کرد بۆ چونە ناو باشـووری کوردستان.

٣. حکومـەتی عێراق لە گێژاوی ئەم هاوکێشە سیاسییانەی لە باشووری کوردستاندا ڕویداو لەپای هاریکاریی پ.د.ك بۆ ئێران، ٨ هەزار کەسی لە خێڵەکانی بارزان ڕەشەکوژ کرد[5]، ئەمەش بەبێ گرفت بۆی چووە سەرو لەناو ڕووداوەکانی یەکەم جەنگی کەنداودا ون بوو، کە عێراقی هاندا لە ساڵانی دواتر چاو نەترسانەو بوێرانە بە بەهانەی جەنگ، دەستی بە شاڵاوی جینۆ ساید لە دژی کورد بکات.

٤. لێدانی بزووتنەوەی کوردی لەباشووری کوردستان بەپێی ڕێکەوتنێکی عێراق-تورکیا، تەنها پرۆسەیەك نەبوو دژی بزووتنەوەی کوردی لە باشوورو باکووری کوردستان، بەڵکو دژی

1 جرجیس حسن: ترکیا فی الاستراتیجیة الامریکیة، ل/١٠٠.

2 روبرت نولسن: المسألة الکردیة، ل/٤٨.

3 دیڤد ماکداول دەڵێت ژمارەی کوژراوەکان ٣٠٠ پێشمەرگە بوون" بڕوانە: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل/٥٧١.

4 جرجیس حسن: ترکیا فی الاستراتیجیة الامریکیة، ل/١٠٢-١٠٤.

5 کریس کوچیرا: بزووتنەوەی نەتەوەی کورد، بەرگی یەکەم، ل/٦٨.

هەر جۆرە بەرەیەکی یەکگرتوی کوردی هەر چوار پارچەکە بوو، کە ئەگەری دروست بوونی هەبوو، مەترسی ئەوەی لێدەکرا کە بە زەبری هێز، ئەم بەرەیە گۆڕانکاری لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا ئەنجام بدات[1] .

دوابەدوای ئەم رووداوانە لە ٣/دیسەمبەر/١٩٨٣ دا حکومەتی عێراق لەگەڵ ی.ن.ك بە سەرۆکایەتیی جەلال تالەبانی دەستی بە گفتۆگۆ کرد[2]، لەگەڵ نزیکبوو نەوەی کەمتر لەچەند رۆژێك بۆ ئەوەی رێکەوتنەکە واژۆ بکرێت، وەزیری دەرەوەی تورکیا گەیشتە بەغداو هۆشداریدا، ئەگەر عێراق لەگەڵ کوردا بگەنە رێکەوتنێك ئەوا تورکیا لوولە نەوتییەکانی کەرکووك-ئەسکەندەرونە دەبەستێت[3]، ئەم هەڵوێستەی تورکیا بە ئاشکرا روون بوو، کە جگە لەوەی نەیدەویست کورد لە عێراقدا بە ناوی بەدەست هێنانی ئۆتۆنۆمیەوە لە ناوچە نەوتیەکانی کەرکووك نزیك بکەوێت، لە لایەکی تریشەوە کورد لەجەنگی عێراقی- ئێران بە هاوپەیمانی ئێران ناسرا بوون، ئەمەش دەبووە هۆی بەهێز بوونی تای تەرازوی هێزی سیاسیی‌و سەربازیی‌و ئابووری بە قازانجی ئێران، دواجار بە سوودی ئێران‌و بەزیانی عێراق‌و تورکیا کۆتایی دەهات. لەم خاڵەوە دەرکەوت تورکیا مەبەستی یەکلایی کردنەوەی شەڕ نەبوو، بەڵکو ویستی لەسەر بەردەوامبونی شەڕ بوو، کە بەو هەڵوێستەی، گفتوگۆی نێوان کوردو عێراقی شکست پێهێنا لە ١٥/یەنایر/١٩٨٥[4] .

ی.ن.ك لە ١٩٨٦دا، رێکەوتننامەیەکی ستراتیژی لەگەڵ ئێراندا واژۆکرد، بەپێی رێکەوتنەکە ئێران تەواوی هاریکاری خۆی بۆ ی.ن.ك لە رووی پرچەك کردنەوە دەربری[5]، کە ئەمە هۆکاری سەرەکی بوو بۆئەوەی بە پشتیوانی هێزی تۆپخانەی ئێران هێرشێکی ٢٥٠٠ پێشمەرگەیی بکاتە سەر بیرە نەوتیەکانی کەرکووك لە ١٠/ئۆکتۆبەر/١٩٨٦[6] .دەستبەجێ تورکیا رایگەیاند نەوتی کەرکووك کەوتۆتە ژێرباری هەڕەشەی هێزی کوردی[7] . بە هۆی ئەم رووداوەوە وویلایەتە یکگرتوەکانی ئەمەریکا لە ٧/ئۆکتۆبەر/١٩٨٦دا رەنگی سەوزی بە تورکیا دا، لە کاتێکدا ئەگەر نەوتی کەرکووك کەوتە بەر مەترسی ئێران ئەوا بۆ تورکیا رەوا

---

1 صبرية احمد لافى: الاكراد فى تركيا، جامعة المستنصرية، معهد دراسات الاسيوية الافريقية، ١٩٨٥، ل/١٣١-١٣٣.

2 ریباز: قەندیل بەغدای هەژاند ١٩٨٠-١٩٨٨، بەشی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری هەولێر ١٩٩٣، ل/٩٢.

3 خليل ابراهيم الناصرى: النطورات المعاصرة فى العلاقات العربية-التركية، مطبعة الراية، بغداد.١٩٩٠ ل/٢٢٥.

4 رويرت ولسن، المسألة الكردية ل/٤٥.

5 کریس کوچیرا: بزووتنەوەی نەتەوایەتییی کوردی، بەرگی یەکەم، ل/٧٧-٧٨. دیڤد ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل/٥٧١.

6 رێباز: قەندیل بەغدای هەژاند،١٨١-١٨٢.

7 یوسف گۆران: سیاسەتی تورکیا لەکوردستانی عیراقدا ١٩٩٠-٢٠٠٠، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژیی کوردستان ، ژ٣، ساڵی نۆیەم، ٢٠٠١، ل/٤٨-٤٩.

دەبێت کە دەست بەسەر ئەوناوچانەدا بگرێت. هەرچەندە تورکیا ئامادەیی خۆی بۆ هەر دژە هێرشێکی ئێرانیو کوردی دەربڕی، بەڵام پرۆژەی ئەمەریکای ڕەتکردەوە چونکە لەو باوەڕەدا بوو خۆی دەخاتە گێژاوی شەڕی کەنداوو کێشەی کورد لە باشووری کوردستان، کە کۆتاییەکەی ڕوون نیە، هاوکات ئێران ڕایگەیاند کە نیازی دەست بەسەراگرتنی باشووری کوردستان باکووری عێراق ی نییەو هاوڕێ لەگەڵ ئەمانەدا عێراق تورکیای دڵنیا کردەوە کە دەتوانێت یەکێتیی خاکی عێراق بپارێزێت[1]. سەرباری هەموو ئەمانە و لەم کێشمە کێشمە دیپلۆماسیەی نێوان وڵاتە ناوچەییەکان لەسەر باشووری کوردستان، کارتی ئەمەریکا ئاشکرا بوو، کە دەخوازێت لە هەموو بارودۆخێکدا نەوتی باشووری کوردستانی لە چنگ دەرنەچێت.

لە کۆتایی ساڵەکانی یەکەم جەنگی کەنداودا حکومەتی عێراق بە ناوی پاراستنی یەکپارچەیی عێراقو لەناوبردنی گێرەشێوێنەکان پرۆسەی جینۆسایدی لە کوردستاندا ئەنجامدا، کە ١٨٢ هەزار کەسی بە ناوی عملیات الانفال لە بیابانەکانی باشووری عێراقدا سەرنگوم کردو ٥ هەزار کەس لە شاری هەڵەبجە کەوتنە بەر گازی کیمیاویو ئەم پرۆسەیە دووساڵی کۆتایی شەڕی خایاند[2]. لێرەوە کێشەی کورد بەرگێکی نوێی پۆشی، ئەوەبوو لە پرسێکی سیاسییو ئابورییەوە گۆڕا بۆ پرسییێکی مرۆڤانە. جەلال تاڵەبانی بە سەردانێکی فەرمی وەك نوێنەری پارتە کوردەکانی عێراق کە خۆیان لە چوارچێوەیەکدا ڕێکخستبوو بە ناوی بەرەی کوردستانی سەردانی واشنتۆنی کرد، مەبەستی سەردانەکەی بەکارهێنانی کارتی جینۆساید بوو بۆ ئەوەی ئەمەریکا ئاوڕێکی مرۆڤدۆستانە لە کوردی باشووری کوردستان بداتەوەو ڕووی ڕاستی ڕژێمی عێراق بۆ جیهان بە گشتیو ئەمەریکا بە تایبەتی ئاشکرا بکات، لەم سەردانەدا جەلال تاڵەبانی چاوی کەوت بە لێپرساوی بەشی باکووری کەنداوی فارسی، بەرپرسی کاروباری عێراق یاریدەری وەزیری مافی مرۆڤ، سەرۆکی لیژنەی پەیوەندییە دەرەکییەکان لە کۆنگرێسی ئەمەریکی[3].

ئەم چالاکیە دیبلۆماسییەی سەرکردایەتیی کورد لە ڕێی بەکارهێنانی جینۆسایدەوە مایەی ناڕەزایی تورکیا بوو، بە تایبەت کاتێك جەلال تاڵەبانی ڕایگەیاند کە ڕەخنە لە تورکیا دەگرێت لە ڕووی شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ کورددا، هەروەها پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ پارتە کوردییەکانی تورکیا نەشاردەوە، تورکیا بەتوندی ڕەخنەی لە ئەمەریکا گرت کە

---

1 بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە جرجیس حسن: ترکیا فی الاستراتیجیه الامریکیه، ل/١٠٥-١١٤.

2 بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: دیڤد ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل/٥٧٨-٥٩٢.

3 پیترو کالبریت: الحرب الاهلیة فی العراق: تقریر قدم فی مارت ١٩٩١الی لجنة العلاقات الخارجیة فی مجلس الشیوخ الامریکی، مرکز دارستان الکردیة، عدد ١ ، اربیل، ١٩٩٢، ل/٤٤.

له واشنتۆنەوە ڕێگا بەوتاری سیاسیی کوردی لە دژی تورکیا دەدرێتو ئەم هەڵوێستەی ئەمەریکای بە هاندانی کورد ناوزەد کرد لە ناوچەکەدا. لە بەرامبەردا ئەمەریکا لە سەرزاری وەزیری دەرەوەی ڕایگەیاند، داواکاری کورد پێویستە لە سنووری دەوڵەتی عێراقدا بێتو ئەمەریکا دەست لە کاروباری ئەو دەوڵەتانە وەرنادات[1] و بەفەرمی بە تورکیای ڕاگەیاند ئەمەریکا بڕیاری داوە هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ بە ئۆپۆزسیۆنی عێراقییەوە نەکات[2] . تورکیا بەمە توانی بۆ ماوەیەك کارتی جینۆساید لەدەست سەرکردایەتیی کورد دەر بکات. بە جۆرێك تاکاتی دووەمین جەنگی کەنداو لە ١٩٩٠-١٩٩١ نەیانتوانی بەکاری بهێنن.

لەدوای کۆتایی هاتنی یەکەم جەنگی کەنداو پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و تورکیا لە ڕووی سیاسیەوە، تووشی بار گرژی بوو،تورکیا مەترسی پرچەکبوونی سوپای عێراقی هەبوو کە خاوەنی چەندین جۆر چەکی ناباو بوو لە بەرامبەردا عێراق ناڕازی بوو بە سیاسەتی بەکارهێنانی تورکیا بۆ ئاوی دیجلەو فورات، هاوڕێ لەگەڵ ئەمانەدا کێشەی کورد لەم گرژبوونەدا ڕۆڵی هەبوو[3] . حکومەتی عێراق دوای ١٧ ڕۆژ لە وەستانی جەنگی کەنداو لە ٢٥/ ئۆگستۆس/١٩٨٨، دەستیکرد بە کێومالکردنی ناوچەکانی باشووری کوردستان، بە تایبەت لە سنووری عێراق-تورکیا بە مەبەستی ریشەکێش کردنی هێزی پێشمەرگەو ئەو لادێ نشینانەی کە یارمەتییان دەدان، سوپای عێراق لەم پرۆسەیەدا چەکی کیمیاوی بەکار هێنا وەك تۆڵەیەك بۆ ئەو یارمەتییانەی کە پارتە کوردییەکان پێشکەشی ئێرانیان کرد بوو لە جەنگدا[4] . حکومەتی تورکیا لە بەرامبەر شەڕی دژە کورد کە لەلایەن عێراقەوە بەرپا کرابوو، خۆی لەبەردەم دووڕیانێکدا بینیەوە کە ئاڕاستەکەیان پێچەوانەی یەکتری بوون، لەلایەك یەکپارچەیی عێراقو سەرکوتکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی لەلایەن حکومەتی عێراقەوە بەرز دەنرخاند، لەلایەکی دیکەشەوە پرۆسەی ڕەشەکوژی ڕژێمی عێراق لە دژی خەڵکی باشووری کوردستانی بەکارێك دادەنا کەنەك تورکیا، بەڵکو جیهان ناتوانێت چاوپۆشی لەم کارە بکات. ئەوە بوو زیاتر لە ٦٠ هەزار ئاوارەی کورد، چوونە ناو خاکی تورکیا. لەپاڵ ئەوەی تورکیا لەژێر فشارێکی ناوخۆییو دەرەکیدا ڕێگەی هاتنە ناوەوەی ئاوارەکانی دا بەڵام لەگەڵ ئەمەشداو بۆ نیگەران نەبوونی عێراق لەهەڵوێستی تورکی لەمەڕ

1 خليل ابراهيم الناصري: التطورات المعاصرة فى العلاقات، ل/٢٥٦-٢٥٧.

2 پیترو کالبریت: سەرچاوەی پێشو، ل/٤٤.

3 فیلیب روبسن: ترکیا والشرق الاوسط، ل/٨٠.

4 پیترو کالبریت: هەمان سەرچاوەی پێشو، ل/٤١.

ئاوارەکانو بۆ هاوسەنگکردنی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر عێراق، تورکیا نکۆڵی لەوە کرد کە چەکی کیمیاوی دژی کوردەکانی پەڕاگەندەی تورکیا بەکار هاتبێت[1] .

حکومەتی عێراق رەخنەی لە هەڵوێستەی کردنەوەی سنوورەکانی تورکیا بە رووی ئاوارەکان گرتو داوایکرد سوپای عێراق مافی خۆیەتی خاکی تورکیا بەپێی رێکەوتننامەی ١٩٨٢ بەکار بهێنێت بۆ راوەدوونانی کوردو ئاوارەکان دەستگیر بکاتو راپێچی عێراقیان بکاتەوە، بەڵام وەزیری بەرگری تورکی لە ٢٨/ئۆگستۆس/١٩٨٨ رایگەیاند، لەژێر هیچ پاساوێکدا رێگە بە سوپای عێراق نادرێت خاکی تورکیا بەکار بهێنێت[2]، لێرەدا عێراق پشتراسبووەوە کە تورکیا رێکەوتنی ١٩٨٢ی یەك لایەنە بۆ سوودی خۆی لەباشووری کوردستاندا بەکارهێناوەو ئامادە نییە عێراق بە هیچ جۆرێك ئەو رێکەوتنە لەناو خاکی تورکیادا بەکار بهێنێت، بۆیە بە فەرمی پاشەکشەی لەو ریکەوتنامەیە راگەیاند.

ژیانی ئاوارەکان لە تورکیا بە بارودۆخێکی نالەباردا تێدەپەڕی، تورکیا لە بڕیارێکدا، هەموو ئەو پەنابەرانەی بە میوان لە قەڵەمداو مافی پەنابەرێتی پێ نەدان، ئەمە لە پێناوی ئەوەدا بوو کە شوێنو جێگەیان بە شێوەیەکی سادەو ساکار بۆ دروست بکات ،هاوکات لە مافی خوێندنو ئیش کردنو نیشتەجێبوونی خۆویستانە لەناو تورکیادا دایانماڵێت[3]. هەروەها تورکیا کاتێك زانی کۆمەکی مرۆیی پێویستی لە رۆژئاواوە بۆ ئاوارە کوردەکان بەدەست ناگات، ئاوارەکانی هاندا کە تورکیا جێبهێڵن، ئەوە بوو هەندێکیان روویان کردە سوریاو هەندێکی تر بەبێ ئاگایی ئێران رەوانەی ناو سنووری ئێران کرانو رێگای لەوانەش نەگرت کە بەرەو یۆنان رۆیشتن، لە کۆتاییدا ئەوانەی کە تا ١٩٨٩ لە ناو تورکیادا مابوونەوە ژمارەیان ٣٦ هەزار کەس بوو بەسەر ئۆردوگاکانی دیاربەکرو ماردینو موش دابەش کران. هەرچەندە ژیانی ئەو ئاوارانە گەلێك ناخۆش بوو، بەڵام دەست گەیشتنی کەناڵەکانی راگەیاندنو رێکخراوە مرۆڤدۆستەکان بە ئاوارەکان، کەم تازۆر دەنگی کوردی گەیاندە رۆژئاوا، رۆژنامەنووسەکانو رێکخراوەکان راستەوخۆ لە زاری ئەو کوردانەوە رووداوی رەشەکوژی حکومەتی عێراقیان بۆ جیهانی دەرەوە دەگواستەوە، رێکخراوی HRW راپۆرتێکی لەسەر کوردستانی باشوورو سیاسەتی سەدام حسین و کیمیابارانی ناوچە کوردییەکانو ژیانی رۆژانەی ئاوارە کوردییەکانی تورکیای بڵاوکردەوە[4] .

---

1 لازریڤ و ئەوانی تر: کوردستانی هاوچەرخ، وەرگێڕانی: گوشاد حەمە ئەمین، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥، ل/ ٦٤

2 Human Rights Watch: What Happened To The Iraqi Kurds? March 11, 1991. www.hrw.org

3 شیری لیدز: گشتی کردستانی ترکیە، ترجمەی: ابراهیم یوسف، ١٣٨٢، ل/٢٢٨.

4 شیری لیدز: گشتی کردستان ترکیە، ل/٢٠٦-٢٣٤.

# تەوەرەی یەکەم

# پەیوەندیی سیاسیی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا لە قۆناغی بەرەی کوردستانیدا

## ۱۹۹۱-۱۹۹۲

سەرەتای دووەمین شەڕی کەنداو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وتارەی سەرەك کۆماری عێراق سەدام حسین، لە بەردەم سەرۆکی بیستو یەك دەوڵەتی عەرەبیدا رایگەیاند: "دەوڵەتی کوەیت نەوت لە رێژەی دیاریکراوی خۆی زیاتر بەرهەم دەهێنێت، ئەمە زیان لە ئابووریمان دەدات، هاوکات دەوڵەت پێویستی بە ۱۰ ملیار دۆلارە، هەروەها سعودیەو کوەیت پێویستە لە ۳۰ ملیار دۆلاری قەرزی عێراق دەستهەڵبگرن"[1].

ئەم وتارە زنجیرەیەك هەوڵی دیپلۆماسی لەگەڵ جووڵەیەکی سەربازی بە دوای خۆیدا هێنا، لە بارودۆخێکی چاوەڕوان نەکراودا لە ۲ی ئۆگستۆسی ۱۹۹۰ کوەیت لەلایەن عێراقەوە داگیر کرا، دەستبەجێ ئەمریکا ئەو بۆچوونەی لا گەڵاڵە بوو کە ئەگەری ئەوە هەیە بەدوای کووەیت سعودیە داگیر بکرێت، لەم بارەدا عێراق دەستبەسەر ۳/۱ ی نەوتی جیهاندا دەگرێتو دەبێتە بەهێزترینو مەترسیدارترین دەوڵەت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەم دەسپێکەوە ئەمریکا بڕیاری دا دوور لەوەی سعودیە پەسەندی بکات یان نا، دەبێت بەرگری لەو دەوڵەتە بکرێت[2].

هەمان رۆژی داگیرکردنەکە، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیاری ٦٦٠ ی پەسەندکرد بۆ دەستبەجێ کشانەوەی سوپای عێراقی لە کوەیت بەبێ هیچ مەرجێك[3].

تا ساڵی ۱۹۹۸ لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان ۳٦ بڕیاری جۆراوجۆر لە بەرامبەر عێراق دەرکران[4]، گرنگترینیان بڕیاری ٦٧٨ بوو، لە نۆڤەمبەری ۱۹۹۰، ئەنجومەنی ئاسایش هەموو رێگایەکی بۆ دەرکردنی عێراق لە کوەیت بەڕەوا لەقەڵەم دا. هاوپەیمانەکان کە لە ۳۰ دەوڵەت پێکهاتبوونو بە سەرکردایەتیی ئەمریکا لە ۱۷/یەنایر-۲٤/فەبرایر/۱۹۹۱ لەگەڵ عێراق کەوتنە جەنگی سەربازییەوە، سەرئەنجام عێراق لەو شەڕەدا شکستی خواردو هێزەکەی

---

1بیار سالینجر وزمیله: حرب الخلیج ملف سری، بدون إسم المترجم، دار الزال، بیروت، ۱۹۹۱، ل/٤٨.

2ریتشارد کلارك، فی مواجهة جمیع الاعداء من داخل، حرب أمریکا علی الإرهاب، ترجمة ولید سعادة، دار الحوار الثقافی، لبنان، ۲۰۰٤، ل/۸۳-۸۵.

3ریاض السندی: قراءة فی قرارات مجلس الأمن، الحلقة الاولی، مجلة متین ، عدد ۷۰ ، ۱۹۹۷، ل/۸۲.

4العراق: من الخوف إلی الحریة. تسلسل زمني للأحداث: الأمم المتحدة – العراق التحالف: www.uninfo.state.gov\arabic\iraq\freedom\index.htm. o Freedom 1991 - 2002

له كوەیت دەركراو بڕیاری ٦٨٧ی نەتەوە یەكگرتووەكانی پەسەندكرد، لەم جەنگەدا عێراق، ١٥٠ هەزار كوژراو لە سەربازو سڤیلو ١٧٠ ملیار دۆلار زیانی لێكەوت[1].

هەڵوێستی كورد لەم جەنگەدا لە هەڵوێستی بەرەی كوردستانی دا بەرجەستەبوو، كە بە شێوەیەكی گشتی پێشبینی رووداوەكانی دەكرد، بەوەی كە عێراق لاواز دەبێتو رەنگە بەرەو رووخان بچێت، بەڵام چارەنووسی كوردو بزووتنەوە نەتەوایەتییەكەی بەهیچ شێوەیەك ئاشكرا نەبوو، لەم سۆنگەیەوە دوو بۆچوونی جیاواز گەڵاڵە بوو:

- ی.ن.ك بە سەركردایەتیی تاڵەبانی خاوەنی بۆچوونی یەكەم بوو، پێی وابوو رژێمی عێراقی بەرەو رووخان دەچێتو بزووتنەوەی كورد پێویستە لەم كایە سیاسییو سەربازییەدا بەشدار بێت، لەم پێناوەدا لە سەردانێكیدا بۆ واشنتن، پێشنیاری ئەوەی كرد كە دەتوانێ سێ هەزار پێشمەرگە لە ماوەی چەند هەفتەیەك ئامادە بكات بۆ كردنەوەی بەرەی جەنگ لەباشووری كوردستان دا، هەروەها رێكخستنی راپەڕینێكی جەماوەری سەرتاسەری لەعێراقدا بەرپا دەكات بە یارمەتی هێزە بەرهەڵستكارە عێراقییەكان، بەڵام لەلایەن كۆشكی سپی ئەمریكاوە پێشوازی لێنەكرا، تەنها دوو ئەندامی كۆنگرێس كۆبونەوەیان لەگەڵدا كرد[2] لەگەڵ ئەوەشدا ی.ن.ك پێشمەرگەی بۆ رووداوە خێراكانی جەنگ ئامادەكرد[3].
- پ.د.ك بە سەركردایەتیی بارزانی لەگەڵ پارتی سۆسیالستی كوردستان، لەو باوەڕەدا بوون كە نابێت كورد بەشداری بكات، چونكە لە نێوەندی شەڕكەراندا دەبێتە سوتەمەنیی جەنگ[4]، هەروەها لەو باوەڕەدا بوون، بەشداریكردن لەشەڕی دژە عێراق دەبێتە خیانەتێكی كوردو لە مێژووی دەوڵەتی عێراقیدا تۆمار دەكرێت، ئەمەو رایەكی دیكەش هەبوو كە نابێت بزووتنەوەی كورد بەشداری جەنگ بكات، تا بزووتنەوەكەی بە فەرمی لەلایەن ئەمریكاو هاوپەیمانەكان نەناسرێت[5].

لەنێوان كێشمەكێشی ئەم دوو رایەدا ئەمریكا بایەخی بە بزووتنەوەی كورد نەدا، چونكە ئامانجی ئەمریكاو هاوپەیمانەكان دەركردنی سوپای عێراق بوو لە كوەیت نەك رووخاندنی

---

1ماريون فاروق سلوغنت وزميله: من الثورة الى الديكتاتورية، العراق منذ ١٩٥٨، ترجمة مالك النبراسي، منشورات الجمل، ألمانيا، ٢٠٠٣، ل/٣٧١.

2نادر ئینتسار: ئیتنۆ نەتەوایەتیی كورد، وەرگێرانی: عەتا قەرەداغی، ل/٣٨ -٣٩ .

3شەوكەت حاجی مشیر: چیۆەڕۆ دەروازەیەك بەرەو كوردستان، ئەوەی دیومە لەراپەڕینی ١٩٩١ دا، خانەی چاپو بڵاوكردنەوەی قانع، سلیمانی ٢٠٠٣، ل/٨-١٠ .

4نادر ئینتسار: ئیتنۆ نەتەوایەتیی كورد، ل/٣٨-٣٩.

5كریس كۆچیرا: بزووتنەوەی نەتەوایەتیی كورد، بەرگی یەكەم، ل/١٠٣ .

ڕژێمی سەدام حسین[١]، جگە لەوەی ئەمریکا لە ڕووی زانیاری بە کۆمەڵگای عێراقیو پارتە بەرهەڵستکارەکان ئاگادارییەکی ئەوتۆی نەبوو[٢]، ئەمە وایکرد خۆی لە بەرهەڵستکارانی عێراق بەهەموو باڵەکانیەوە بەدوور بگرێت. لەم سەروبەندەدا بەرەی کوردستانی بە ئاشکرا، لە بەیاننامەیەکدا لە سەرەتای دیسەمبەری ١٩٩٠ بێلایەنی خۆی دەربڕی[٣]، بەڵام بە نهێنی دەستی بە خۆڕێکخستن کردبوو، بەتایبەتی لەگەڵ ئەندامو لایەنگرانیان لەناو شارەکانی باشووری کوردستان[٤].

سەبارەت بە هەڵوێستی تورکیا لەم جەنگەدا، بێلایەنیی خۆی ڕاگەیاند تا ئەوکاتەی عێراق لە بەرامبەریدا دەستپێشخەری شەڕ نەکات[٥]، هاوکات جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە سەرجەم بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان جێبەجێ دەکات، ئەوەبوو لە ٧/ئۆکتۆبەر/١٩٩٠ بۆرییە نەوتییەکانی عێراقی لە خاکی خۆی داخست، هەروەها مۆڵەتی بە فرۆکەکانی ئەمریکا دا کە ١٢ بنکەی وڵاتەکەی بەکار بهێنن[٦]، ئەمە وەك سەرەك کۆمار ئۆزال دیاری دەکات "بۆ ئەوەیە لەسەر مێزی سەرکەوتوانی شەڕ ئامادەبین"[٧].

ئەمە هەڵوێستی فەرمی تورکیا بوو، بەڵام ئۆزال بە پەنهانی دوو فایلی نوێی لەم بارودۆخەدا تاوتوێ کرد، کە فایلی ویلایەتی موسل و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بوو. لە ١٥/یەنایەر/١٩٩١ لە کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆکی حکومەت یلدرم ئاقبلوت و سەرەك ئەرکانی سوپا، نەجیب تورومتای، ئەو پێشبینییەی کرد کە ڕژێمی عێراق دەڕوخێت، هێزی هاوپەیمانان لە باشوورەوە ڕووەو ناوەڕاستی بەغداد دەچن، لەم کاتەدا "بچینە باکوورو بگەینە موسڵ وکەرکووك"[٨]. ئەمە لەکاتێکدا بوو کە ڕاوێژکاری ڕاگەیاندنی کۆشکی کۆماری کایا

---

1أندرو كوكبورن وزميله:صدام القادم من تحت الرماد، ولادة صدام حسين من جديد، ترجمة :على عباس، دار المنظر، بيروت، ٢٠٠٠، ل/٧٦.

2جۆناثان راندل: أمة فى شقاق، دروب كردستان كما سلكتها، ترجمة: فادى حمود، دار النهار، بيروت١٩٩٧، ل/١١٢-١١٣.

3عبدالله عسكرى: مستقبل العراق بعد أزمة الخليج، مجلة ئالاى ئيسلام ، عدد ٥ ، سنة ١٩٩١، ل/١١-١٢ز.

4ديڤد ماكداول: مێژووى هاوچەرخى كورد، ل/٦١٠-٦١١.

5ألكسندر بيلونوغوف: الكرملن وحرب الخليج الثانية، واشنطن تأخذ على موسكو محاولة إنقاذ الزبون القديم ، تقرير بدون مكان وسنة الطبع.

6محمد وهب السيد: أزمة إحتلال العراق للكويت، ل/١٩٤-١٩٥.

7أزاد گرميانى: القضية الكردية ومؤشرات حرب الخليج ، مجلة ئالاى ئيسلام ،عدد ٥ ، ١٩٩١ ، ل/ ١٥.

8محمد نورالدين: تركيا فى الزمن المتحول، ل/٢٤٥.

تۆپری راسپارد بوو بە هەڵدانەوەی دۆسیەی مێژووی کێشەی ویلایەتی موسل، ئەویش لەدوو توێی راپۆرتێکی ٤٠٠ لاپەڕەدا ئامادەی کرد[١] .

هەروەها رۆژنامەکان بە ئاشکرا "نەخشەی ئۆزال"یان بڵاوکردەوە کە عێراقی بەسەر سێ دەوڵەتی عەرەبی و کوردی و تورکمانی لە یەکیەتییەکی فدراڵیدا دابەشکردبوو، پێشنیارەکانی سەرۆك کۆمار لە لایەن سەرۆکی حکومەت و سەرەك ئەرکان پێشوازی لێنەکرا، چونکە بە رای یەکەم واتە سەرۆکی حکومەت بەشداری کردنی تورکیا لە جەنگی دژە عێراق سەرکێشی بووەو دەستبەسەراگرتنی پارچەیەکی عێراق سەرکێشییەکی گەورەترە، هەروەها سەرەك ئەرکان لە وەڵامی ئەم پێشنیارەدا ئەوەی خستە روو کە ئەگەر سوپا بچێتە ئەو شوێنە ئەوا ناتوانێت بە ئاسانی دەربچێت، کە وادەکات کارەکە هەڵەبێت[٢]. هەموو ئەمانە وایانکرد سەرکردە تورکەکان لەم پێشنیارە پاشەکشە بکەن و لە بەرامبەردا سوریاو ئێران وەك دوو بنکەی بەرهەڵسکارانی عێراقی لە دەستێوەردانی یەکپارچەیی عێراق ئاگادار کردەوە، لەوە زیاتر ئۆزال رایگەیاند رێگە نادات لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگ دەوڵەتێکی کوردی لە باکووری عێراق دابمەزرێت[٣] .

دۆسیەی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کوردی باشووری کوردستان، فایلێکی گرنگتر بوو کە رۆژنامەنووسەکانی وەك: جنگیز چاندار و جوناسان راندل، لەگەڵ ئۆزال لە سەرەتای شەڕی کەنداو باسیان لێوە کردبوو، هەروەها رۆژنامەنووس کامەران قەرەداغی وەك کوردێکی باشووری کوردستان لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ئۆزال دا، ئەوەی بۆ روونکردەوە کە ئامانجی کورد بەدیهێنانی مافی نەتەوایەتییە لەسنووری یەکێتیی خاکی عێراق. هەریەك لەمانە پێشنیاری پەیوەندیی بەستنی تورکیای لەگەڵ ئەم بزووتنەوەیە کردبوو[٤]، لەم سۆنگەیەوە ئۆزال لەو باوەڕەدا بوو، بوونی بزووتنەوەیەکی بەهێزی کورد لە عێراق کە بەرەو هەڵوەشان دەچێت، پێدەچێت کاریگەری سەرەکی لەسەر ئایندەی عێراق پەیدا بکات، ئەمە لە کاتێکدا کورد هاوسنووری تورکیایەو لە ناوچەیەکدایە تورکیا بۆ ئاسایشی نیشتمانی لە رووی سیاسیی و ئابوورییەوە بە گرنگی دەزانێت. کامەران قەرەداغی لە ئۆزالەوە ئەو پەیامەی بە سەرکردە کوردەکانی عێراق گەیاند، کە ئەو تێگەیشتنەیان لەلا گەڵاڵە بێت، تورکیا وەك

---

1جوناثان رِاندل: أمة فی شقاق، ل/١٢٤.

2 محمد نور الدين: تركيا فی زمن المتحول، ل/٢٤٦.

3محمد وهب السيد: أزمة إحتلال العراق للكويت، ل/١٩٦ .

4ميشال نوفل واخرون: العرب والاتراك فی العالم المتغير،الجزء الاول، مركز الدراسات الأستراتيجية والبحوث والتوثيق، بيروت، ١٩٩٣، ل/١٣١-١٣٢.

دوژمنی خۆیان سەیر نەکەن، هەر بۆ پشتگیری وتەکانیك ئۆزال ئەوەی بیرهێناوەتەوە کە دایکی لە رەگەزدا کوردە[1].

سەرکردایەتیی کورد لەم بارەیەوە چاوەڕوانی ئەو هەڵوێستەی تورکیا نەبوو، چونکە سەرەڕای ئەوەی مێژوویەکی خوێناوی کورد هەیە لە سەردەستی ئەم دەوڵەتە، کەسێکی وەك تاڵەبانی ئەوەی لەلا روونو ئاشکرا بوو، تورکیا لەمپەر بووە لە بەردەم چەند هەوڵێکی کوردی لەوانە: دانوستانی ساڵی ١٩٨٤ لەگەڵ عێراق، بەنێودەوڵەتیی بوونی کێشەی جینۆسایدی کورد لە ساڵی ١٩٨٨[2]، هەروەها سەرنەکەوتنی گەشتەکەی لە نۆڤەمبەری ١٩٩٠ بۆ ئەمریکا[3].

تەریب لەگەڵ رووداوەکانی جەنگو نزیکبوونەوەی هێڵی پەیوەندیی بزووتنەوەی کوردو تورکیا، سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بۆش ی باوك، لە ١٥/ فیبرایر/١٩٩١ بۆ پشتگیریکردنی هێرشی زەمینی سوپای هاوپەیمانان ئاماژەی بە راپەڕینی عێراقییەکان کردو وتی: "شێوازێکی تر هەیە بۆ رێگرتن لەخوێنڕشتن، ئەوەش لە رێگای دەسەڵات گرتنی گەلو سوپای عیراقو ناچارکردنی سەدام حسێنی دیکتاتۆرە بۆ دەستبەرداربونی لە دەسەڵات"[4]. ئەم راگەیاندنە بەرهەڵستکارانی عیراقی سەرلەنوێ ووریا کردەوە، هاوڕێ لەگەڵیدا پەیامێك بوو بۆ وڵاتە هەرێمیو جیهانییەکان کە داهاتوو بە قازانجی سەدام حسێن نییە.

لەبەر رۆشنایی ئەم دۆخە نوێیە ئۆزال لە ١٦/فێبرایەر/١٩٩١ جنگیز چاندار ی ناردە لەندەن بۆ سازکردنی چاوپێکەوتن لەگەڵ تاڵەبانیو موحسین دزەیی، وەك نوێنەری بارزانی، هەمان رۆژ یەکەم نامەی دەوڵەتی تورکیا لەلایەن نوسینگەی سەرەك کۆمارەوە گەیشتە دەستی کورد مەبەست کامەران قەرەداغییە، لە ناوەرۆکیدا پەیامێکی لە خۆ گرتبوو بە مەبەستی رێکخستنی کۆبوونەوەیەك نێوان تورکیاو بزووتنەوەی کورددا[5]، لە سەرویەندی رێکخستنی دانیشتنەکاندا، لە ٢٧ی فێبرایر١٩٩١ دووەمین جەنگی کەنداو راگیرا، لە ٢٨/ فێبرایر راپەڕین لەباشووری عێراق دەستی پێکردو لە ٥/مارت/١٩٩١ لە هەرێمی کوردستان هەڵگیرسا، تا رۆژی٢٠/مارت/١٩٩١ چوار شاری گەورەی هەرێم، سلێمانیو هەولێرو دهۆكو کەرکووك ئازادکرانو کەوتنە ژێر دەسەڵاتی بەرەی کوردستانی.

---

1رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/١٢٥ ، ١/٤/١٩٩٦.

2بڕوانە بەشی دووەم تەوەرەی سێیەم.

3أزاد گرمیانی: القضية الكردية، ل/١٤.

4علي الشمراني: صراع الاضداد المعارضة العراقية بعد حرب الخليج، دار الحكمة ، لندن، ٢٠٠٣، ل/ ١٧٩.

5رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/١٢٥١ ، ١٠/٤/١٩٩٦.

ڕێکەوتی کۆبونەوەکان ٩-١٠/مارت/١٩٩١ بوو، کە تاڵەبانیو موحسین دزەیی، بەشێوەی نهێنیو دوور لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیا تۆنگان ئۆزگیری باسیان لە ڕاپەڕینی کوردو عیراقییەکانو دروستبونی پەیوەندیی نێوانیانو هاریکاریی تورکیا بۆ ڕاپەڕیوان کردبوو. سەرەڕای ئەوە شاندی کورد داوای ئەوەی کردبوو ئەمریکا گوشار لەسەر دیپلۆماسیەتی بزووتنەوەی کورد هەڵبگرێت [1] .

ڕۆژی ١١/مارت/١٩٩١دا تاڵەبانی کۆبونەوەیەکی نهێنی لەگەڵ ئۆزال کرد، دواتر ڕایگەیاند لە تورکیاوە پشتگیریو سۆزی بۆ گەلی کورد دەستکەوتووە، پاش ئاشکرابوونی کۆبوونەوەکانی نێوان تاڵەبانیو سەرۆکایەتی کۆمارو حکومەتی تورکیا، کەناڵی ڕاگەیاندن بەسەرسامییەوە باسیان لەم ڕووداوە کرد، سەرۆکی گەورەترین گرووپی بەرهەڵستکاری پەرلەمانی سلێمان دیمریل، ئەمەی بە "یاریکردن بەئاگر " وەسفکردو تۆمەتی خیانەتی دایە پاڵ ئۆزال، لە بەرامبەردا سەرۆکی حکومەت یلدرم ئاقبلۆت ئەوەی خستەڕوو "کوردی عێراق ئارەزووی پێکهێنانی دەوڵەتیان نییە" [2] .

ئەنجامەکانی ئەم کۆبونەوانە وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لە پەیوەندییەکانی نێوان بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی هەرێمی کوردستانو حکومەتی تورکیا، چونکە بۆ یەکەمجار لەسەر دەستی ئۆزاڵ و تاڵەبانی دەرگا لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان تورکو کورد کرایەوە وەك دوولایەنی خاوەن بەرژەوەندی هاوبەش، لە کێشەیەکی زۆر ئاڵۆزی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە کێشەی کورد بوو لە هەرێمی کوردستان. بە دوایدا تاڵەبانی گرێیەکی گەورەی لە ستراتیژیەتی تورکیا بەرامبەر هەرێمی کوردستان کردەوە، ئەویش ئەوەبوو بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کوردیی لە هەرێمی کوردستان بە شێوەیەك دەرخست کە ئامانجیان گۆڕینی نەخشەی عێراق نییەو پابەندن بە یەکێتیی خاکی عێراقو سنووری مافەکانیان لەهەرێمی کوردستانەوە بۆ هیچ دەوڵەتێکی ناوچەیی تێپەڕ ناکات، سەرباری هەموو ئەمانە، ئۆزال بناغەیەکی پەیوەندیی بە تینی داڕشت لە نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا بە جۆرێك دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٩٣دا مرد، سەرکردە تورکە توندڕەوەکان نەیانتوانی ئەم پەیوەندییە بپچڕن.

ڕاپەڕینی کورد زۆر بە خێرایی پەرەی سەندو کۆتایی هات، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێکی ناوخۆییو دەرەکی، لەگرنگترینیان نەبوونی پلانێك بوو بۆ بەڕێوەبردنو

---

1 جوناثان راندل: أمة فى شقاق، ل/١٠٤ -١٠٥.

2 وقائع تطور العلاقات بين تركيا والاكراد العراقين ، اعداد: محمد نورالدين، مجلة شؤون تركية ، عدد ٢ ، ١٩٩٢، ل/١٣.

بەرگریکردنی لە شوێنە رزگارکراوەکان، هەروەها راپەڕینەکە هاوکات نەبوو لەگەڵ کاتی جەنگی نێوان هاوپەیمانانو عێراق، بە واتایەکی تر ئەگەر راپەڕین بە چەند رۆژێکی لە پێش ٢٧ی فبرایر١٩٩١ بەرپا بوایە، ئەوا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی راپەریوان دەبوونە هاوپەیمانی هاوپەیمانەکانو وتارەکەی جۆرج بۆش هەر لەم پێناوەدا ئامانجی خۆی دەپێکا، لەم گریمانەوە شێوەی داواکاری نوێنەری بزووتنەوەی کورد لە بەرامبەر تورکیادا گۆڕانی بەسەردا دەهات، بەجۆرێك تورکیا خۆی لەبەردەم یارمەتیدەرانی هاوپەیمانانی هاوپەیمانەکان دەبینیەوە لە باری سەرکەوتندا نەك یارمەتیدانی ئاوارە دەرکراوەکانی دوای راپەڕین لە باری دۆڕاندا.

عێراق، لە ٢٩-٣٠/مارت/١٩٩١ زۆر بە توندی راپەرینەکەی سەرکوت کرد، رێکخراوی بەرگریکار لە مافی مرۆڤ، جگە لە چەندین کوژراو، کوردە بێسەرو شوێنکراوەکانی بە ٢٠٠ کەس مەزەندە کرد. لە بەرامبەردا تێکڕایی جەماوەری کوردستان لە ترسی بەکارهێنانی گازی کیمیاویو پرۆسەی ئەنفالێکی نوێ، دەستیان کرد بە کۆچڕەوێکی بەرفراوانو ئاوارەی سنوورەکانی تورکیاو ئێران بوونو زیاتر لە ٤٥٠ هەزار کەس رویکردە تورکیا[1] .

لە سەرەتادا هەڵوێستی تورکیاو ئێران لێکچوونی تیادا بوو، هەردوولا لە ٢-٣/ئەپریل/١٩٩١ یاداشتنامەیەکیان گەیاندە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئاگاداریان کردەوە کە ئاوارەکان هەڕەشەن بۆ سەر ئاشتیو ئاسایشی ناوچەکە[2]، لەلایەکی تریشەوە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا لە ٢ی ئەپریل لە کۆبونەوەیەکدا سەبارەت بەم رووداوە ئەوەی خستە روو، مەبەستی عێراق لە ئاوارەکردنی دانیشتوانەکەی تێکدانی ئاسایشی تورکیایە، ئەنجومەنەکە ئەو بۆچوونەی لاگەلاڵەبوو کە بەوێنەی ئاوارەکانی فەلەستین*، کە لە لوبنانو ئەردەن نیشتەجێبوون، بەهەمان شێوە کوردە ئاوارەکان لەناو تورکیادا نیشتەجێدەبنو کێشەی کورد لەتورکیا هێندەی تر ئالۆز دەبێت[3] .

تورکیا لێکدانەوەی بۆ رووداوەکان هەرچۆنێك بوو، لە دواجاردا بە سوودی کورد کۆتایی هات، چونکە وەك نەریتێکی نێوان دەوڵەتە ناوچەییەکان بەتایبەتیو جیهان بەگشتی تا پێش ساڵی ١٩٩٠ هەبوونی نەتەوەیەکی وەك کورد کە مافە سروشتییەکانی پارێزراو بێت، بە

---

1Human rights watch :The 1991 uprising in Iraq and its aftermath ‹copyright June 1992 Number: 92-72351 ‹ www.hrw.org.

2 بڕوانە پاشکۆی ژمارە/٣ .

* لە ساڵی ١٩٤٧ بە دواوە ،فەلەستینیەکان لەژێر فشاری ئیسرائیل، دەستە دەستە ئاوارەی دەوڵەتە هاوسێکان بوونو تیایدا نیشتەجێ بوونو چەندین گرفتیان بۆ ئەو دەوڵەتانە دروست کردووە.

3عبد الرحمن سليمان زيباری: الوضع القانونی لآقلیم کردستان العراق، ل/٢٦١.

هەڕەشەیەك دادەنرا بۆ سەرئاشتیو ئاسایشی نێودەوڵەتیی، بەڵام ئاوارەبوونی کورد بەو ژمارە زۆرە، هاوکێشەکانی هەڵگەڕاندەوە، تورکیاو ئێرانی هێنایە سەربار بۆ ئەوەی داوای ئەوە بکەن لە نەتەوە یەکگرتووەکان عێراق دەستبەرداری پێشێلکردنی مافی ئەم نەتەوەیە بێت، بە پێچەوانەوە ئەم کارە ئاشتیو ئاسایشی ناوچەکە دەشێوێنێت، لەوە زیاتر ئەو مەرگەساتەی کوردەکان کە ڕۆژانە ١٠٠-٢٠٠ کەس دەبوونە قوربانیو لە میدیاکانەوە پەخش دەکرا، بۆ ئەستۆپاکی تورکیا لەو ڕەشەکوژیە، بۆ بەرگرتن لە گواستنەوەی ئەوبارە، تورکیا وا لێدەکات کە بەهاوکاریی فەرەنسا پڕۆژە بڕیاری ٦٨٨ گەڵاڵە بکاتو پێشکەش بە ئەنجومەنی ئاسایش بکرێتو لەلایەن ئەم ئەنجومەنە پەسەند بکرێت. بایەخی ئەو بڕیارە لەوەدا بوو، بۆ یەکەم جار کورد وەك نەتەوەیەکی ستەمدیدە ناوی چووە ناو بڕیارێکی نەتەوە یەکگرتووەکان[1]. لەلایەکی دیکەشەوە چونکە تورکیا نەخشەی بڕیارەکەی بە هاوبەشی لەگەڵ فڕەنسا پێشنیار کردبوو، ئەو دەوڵەتە هەستیار بە کێشەی کوردی پابەند کرد کە بەشداربێت لە پاراستنی سیستەمی ئاسایشی گشتی (نظام الامن الجماعی) لە ناوچەکەدا کە ئامانجە سەرەکییەکەی پاراستنی نەتەوەی کورد بوو.

لەم سۆنگەیەوە فەرەنساو پاشان بریتانیاو دواتر ئەمریکا، لەبەر ئەنجامی کۆمەڵێك بۆچوونو پڕۆژە بۆ پاراستنی ئاوارەکان لە هەڕەشەی برسیەتیو ئاوارەییو مەترسیی عێراق، لەبەر ڕۆشنایی بڕیاری ٦٨٨ لەلایەن سەرەك وەزیرانی بریتانیا جۆن مێجەر، پێشنیاری بیرۆکەی ناوچەی پارێزراو-Safe Heven کرا، لەلایەن ئەمریکاوە لەژێر ناوی ناوچەی دژەفڕین-No-fly zoon چووە باری جێبەجێکردن، لە بنکەی ئەنجەرلیك ەوە فڕۆکەکانی ئەمریکا ناوچەکەیان لە فڕۆکە عێراقیەکان گرت، دواتر ئۆپەراسیۆنی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی-Operation Provide Comfort بۆ ئاوارەکان لەلایەن سوپایەکی نێودەوڵەتیی فرەڕەگەز* کە ٩٤٩٣١ سەرباز بوون[2]، دەستپێکرا بۆ فەراهەم هێنانی ناوچەیەکی ئارامو ئاسایش، تا ئاوارەکان بە دڵنیایی لە ژیانیانو دوور لە مەترسی سوپای عێراق بۆ شارو شارۆچکەکانی خۆیان بگەڕێنەوە، ئەم هێزە تامانگی سێپتەمبەری١٩٩١ کاری سەرەکی خۆیان تەواو کرد، کە گەڕانەوەی زۆرینەی ئاوارەکان بوو، لێرەوە پاشەکشەیان کرد بۆ ناو بنکەی ئەنجەرلیك لە ناو خاکی تورکیاو لە قەزای زاخۆ سەر بە پارێزگای دهۆك

---

1ارواء محمد ملا: سیاسة تدخل الآمریکی دراسة الحالة فی شمال العراق، رسالة ماجستیر، غیر منشورة، کلیة العلوم السیاسة، جامعة بغداد ،١٩٩٨، ل/١٢٣ .

* ئەم سوپایە پێکهاتبوو لە سەربازانی :ئەمریکا،بریتانیا،فەرەنسا،ئەڵمانیا،کەنەدا،ئیسپانیا،ئیتالیا.

2 بۆ زانیاری زیارت بڕوانە: عبد الرحمن سلیمان الزیباری :الوضع القانونی لاقلیم کردستان، ل/٢٨٦- ٢٩٦.

به ناوی سەنتەری هەماهانگی سەربازی- Military Co-Ordination Center که کۆکراوەکەی MCC بوو، ئەم هێزە بە چەکوشی ئامادە- Operation Poised Hammer ناسراو نوسینگەیەکیان کردەوە[1] .

سەرجەم ئەم پێشنیارو بڕیارانە بە ئامادەییەکی تەواوی تورکیا بوو، ئەوەی ئەم خەسڵەتەی پێدا بوو، پێگە ستراتیجییەکەی بوو[2]، هەروەها تاکە ئەندامی ناتۆ بوو لەناوچەکە دا، هاوکات هاوسنووری ئاوارەی کوردو هەرێمەکەیان بوو، ئەمە وایکرد بوو تورکیا لەگەڵ ئەوەی بوونێکی هەمیشەیی هەبوو، هەمان کات پابەندییەکی تەواوی بەسەردا سەپا لە بەرامبەر سەرجەم بڕیارو ئۆپەراسیۆنەکاندا .

پەرلەمانی تورکیا لەمانگی ئەپریلی١٩٩١، ڕەزامەندی لەسەر بەکارهێنانی بنکەی ئەنجەرلیك دەربڕی کە بۆ ماوەی شەش مانگ لە لایەن هاوپەیمانان لە میانەی ئۆپەراسیۆنی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی بەکار بهێنرێت، تورکیا بە چوار فڕۆکەی جەنگی بەشداری تیادا کرد، لە ئۆپەراسیۆنی چەکوشی ئامادە لە کۆی ١٤١٦ سەربازی هاوپەیمانان، ٧٤ سەربازی تورکی بوو[*]، هەروەها لە نوسینگەی MCC هەمیشە لە کۆی ١٠ ئەفسەری هاوپەیمانان دوو ئەفسەریان سەر بە سوپای تورکی بوون[3] .

بوونی تورکیا لە سستەمی پارێزگاریکردنی کوردو هەرێمەکە ئەو سەنگەی پێبەخشی بوو، کە نەك لەدەرەوە، بەڵکو لە ڕووداوە ناوخۆییەکانی هەرێمی کوردستانیشدا ئامادەیی هەبێت لە گرنگترینیان دانوستانەکەی بەرەی کوردستانی و حکومەتی عیراقی بوو.

دانوستاندن المفاوضات، پرۆژەیەك بوو کە لەلایەن حکومەتی عیراقەوە لە کاتی ڕاپەڕینو دوای گرتنی پارێزگای کەرکوك پێشنیار کرابوو، بەڵام لە کاتێکدا جێبەجێ کرا بەرەی کوردستانی شارەکانی لە دەست دەرچوو، تەنها لە شاخو سنوورەکان دەسەڵاتی هەبوو[4] . ئەمە وایکرد بەرەی کوردستانی کەوتە ژێر فشاری ڕەوشی خراپی ژیانی ئاوارەکانو بەخێرایی

---

1 رواء محمد ملا: سياسة تدخل الآمريكي، ل/١٢٣.

2جوناثان راندل: أمة في شقاق، ل/١٠٤ -١٠٥.

*دەوڵەتە بەشداربووەکانی هێزی هاوپەیمانان لەئۆپەراسیۆنەکانی چەکوشی ئامادە ناوچەی دژە فڕین ، بریتی بوون لە ئەمریکا، بریتانیا، فەرەنسا، تورکیا.

3ڕواو محمد ملا: هەمان سەرچاوە، ل/١٢٣-١٢٤.

4مام جەلال: ڕاپۆرتی سیاسی،چاپی دووەم، ئۆفیسێتی ڕوناکبیری، سلێمانی،٢٠٠٠، ل/٥٢.

له سەرەتای مانگی ئەپریلی١٩٩١ چووە بەغدادو تاڵەبانی قۆناغی یەکەمی دانوستانەکانی بەڕێوەبرد[١]. تەوەرەی دانوستانەکان چوار خاڵ بوون:

- ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی کوردستان.
- گەشەپێدانی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٧٠.
- دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان.
- دیموکراسیەتو فرەحزبی له عیراقدا[٢].

تاڵەبانی، لەم قۆناغەدا درکی کرد، کە سەدام حسێن و سەرکردایەتیی عێراق، تاکڕەوانە دەڕواننە دانوستانو مەبەستیان دووبارە بە هێزکردنەوەی عێراقە، بە بێئەوەی کێشەی کورد له عیراقدا هەنگاوێك بەرەوپێش بڕوات. لەگەڵ ئەوەشدا لە کاتی دانوستانەکان بەرەی کوردستانی ئەوەی بۆ دەرکەوت، بە بێ ئەوەی بارودۆخی ناوخۆو دەرەوەی کورد هەڵسەنگێنێت دانوستانیان پەسەند کردووە، بەتایبەت لە کاتێکدا کێشەی کورد بە هۆی ئاوارەبوونەوە رەهەندێکی نێودەوڵەتیی وەرگرتووە[٣]. لەم کاتەدا لە میانەی کۆنگرەی ئینتەرناسیۆنال لە تورکیا کە لە ناوەڕاستی مانگی ئەپریل بەڕێوە چوو، ئۆزال بە ئاشکرا پەیامێکی دایە تاڵەبانی کە، سەدام حسێن کەسێکی دیکتاتۆرەو جێگای متمانە نییە[٤]. لێرەوە تاڵەبانی گەیشتە ئەو بڕوایەی پێویستە بەڕێوەچونی دانوستانەکان بە سەرپەرشتیاری نەتەوەیەکگرتوەکانو لەژێر سایەی بڕیاری ٦٨٨ بێت تا عیراق بەجێبەجێکردنی پابەند بکات.

له بەرامبەردا بارزانی کە لە مانگی مایۆی١٩٩١دا سەرۆکی شاندی بەرەی کوردستانی بوو، هەموو هەوڵەکانی بۆ رێکەوتن لەگەڵ حکومەتی عیراقی خستبووە گەڕ، چونکە گومانی هەبوو لە هەڵوێستی نەتەوە یەککگرتوەکانو هاوپەیمانان بەتایبەتیش ئەمریکا، ئەو لەو کلاوڕۆژنەوە دەیڕوانی، کە چاوپۆشی کردن لە نسکۆی ١٩٧٥ و جینۆسایدی ١٩٨٨و راپەرینی ١٩٩١، بەڵگەکی بە هێزە کە کۆمەڵی نێودەوڵەتی لە ئاستی بەرپرسیارێتیدا نییە بەرامبەر کێشەی کورد، جگە لەوە پێی وابوو کە چیتر کورد ناتوانێت خۆیگرێت لە بەردەم رەشەکوژیو ئاوارەییدا، هەموو ئەمانە وایان کردبوو کە مەسعود بارزانی باوەڕی بە چارەسەری ناوخۆیی کێشەی کورد لەناو عیراقدا بە باشتر بزانێت لە بەرامبەر چارەسەر

---

1ازاد گرمیانی: مناورات الجبهة الکردستانية مع الحكومة لماذا والى أين ؟ مجلة ئالای ئیسلام ، ژمارە/٥ ، ١٩٩١، ل/٢٣.

2رغدة نضيف جاسم الربيعي: التوجه الآسرائيلي الى شمال العراق ١٩٥٨ - ١٩٩٨، كلية العلوم السياسية، جامعة بغداد ٢٠٠٠، ل/٢٠-٢١ .

3 مام جەلال: راپۆرتی سیاسی، ل/٤٩-٥٠.

4رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/١٢٨٠ ، ١٩٩١/٥/٩ .

کردنی لە دەرەوەی عیراقدا[1] . ئەوەی ئەم گومانەی بە لای راستیدا برد، دیاریکردنی هێڵی ٣٦ بوو بۆ ناوچەی دژەفڕین کە پارێزگاکانی سلێمانیو کەرکووکی نەدەگرتەوە، هەروەها کشانەوەی هێزی هاوپەیمانەکان بوو لە مانگی یۆلیۆی ١٩٩١، دواجار ڕێگەپێدانی تورکیا بوو بۆ مانەوەی هێزە هاوپەیمانەکان تەنها بۆ ماوەی شەش مانگ. ئەم هۆکارانە وایان کرد لە ٢٢ی ئەپرلی ١٩٩١، لەگەڵ حکومەتی عیراقی بگاتە گەلاڵە کردنی پرۆژە بڕیارێك لە ژێر ناوی "پرۆژەی یاسای ئۆتۆنۆمی لە ناوچەی کوردستان"[2] .

ئەم هەوڵەی بارزانی چەند ئاستەنگێکی هاتە بەردەم، گرنگترینیان وەك سەعد ناجی جواد دەڵێت: "هەولی حکومەتی عیراقی بوو بۆ ئەوەی بڕیاری ٦٨٨ و دەستێوەردانی مرۆیی هێزە فرەڕەگەزەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان شکست پێ بهێنێت"[3] .

لە بەرامبەرداو لە میانەی سەردانی تاڵەبانی بۆ ئەورووپاو ئەمریکا ئەوەیان بۆ روونکردەوە، رژێمی عیراقی ئەگەری رووخانی هەیەو نەتەوەی کورد هەڵە دەکات کە لە دیکتاتۆرێکی وەك سەدام حسین دڵنیا بێت، لەلایەکی تریشەوە پەیمانی ئەوەی وەرگرتبوو، کە یارمەتی کورد دەدرێت لەو هەرێمەی کە لە دوای مانگی نۆڤەمبەر١٩٩١ بە تەواوی لە ژێر کۆنترۆڵی بەرەی کوردستانی دا بوو[4] .

عیراق هەستی بە کاریگەری بۆ چوونەکانی ئۆزال بەسەر تاڵەبانی دا دەکرد، لەم پێناوەدا جێگری سەرۆکی حکومەتی عیراقی تاریق عەزیز لە سەرەتای یۆلیۆی ١٩٩١دا سەردانی ئۆزال ی کرد، لەوە ئاگاداری کردەوە ئەگەر تورکیا دەستبەرداری پشتگیریکردنی کورد نەبێت، ئەوا عێراق ئۆتۆنۆمییەکی گەشەسەندوویان دەداتێ. هەروەها پێشنیاری کردبوو، ئەگەر کورد لە دانوستانەکانی بەغدادا لەسەر داواکارییەکان پێداگری بکەن، ئەوا تورکیا هاوکاریی عێراق دەکات لە سەرکوتکردنی کورد. سەدام حسێن لەم کاتەدا ئەوەی لە رۆژنامەی میللیەت ی تورکی بڵاوکردەوە، کورد دەیەوێت دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنێت کە سنوورەکەی ناوچە نەوتیەکانی کەرکووکیش دەگرێتەوە[5]، ئەمە پەیامێکی ئاگاداریو هەڕەشەکردن بوو بۆ تورکیا لەلایەن رژێمی عیراقەوە، مەبەستی سەرەکیش کێشکردنی تورکیا بوو بۆ ناو رێکەوتننامەیەك لە روالەتدا لە رێکەوتننامەکەی جەزائیر١٩٧٥ بچێتو لە

---

1ادیڤد ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل/٦١٩ .

2مشروع قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان، ١٩٩١/٧/٢٢.

3سعد ناجي جواد: اكراد العراق وازمة الهوية، www.aljazeere.net

4کریس کۆچێرا: بوتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، ل/١٢٥.

5ازاد گرمیانی: مناورات الجبهة الكردستانية مع الحكومة لماذا والى أين ؟ مجلة ئاڵای ئیسلام ، ژمارە/٥ ، ١٩٩١، ل/٢٥.

ناوەڕۆکیشدا ڕەشەکوژکردنی کوردو بزووتنەوەکەی بێت، بەلاّم لە بەرامبەردا، هەڵوێستی ئۆزال بەهیچ جۆرێك وەلاّم دەرەوەی بۆ پێشنیارو هەڕەشەکانی ڕژێمی عیراقی نەبوو، چونکە نەکێشەی کورد لەئاستی ١٩٧٥دا بوو لە رووی هێزو دیپلۆماسیو پشتگیری نێودەوڵەتیی، نەعیراقیش دەوڵەتێکی بەهێزو خاوەن ناوبانگی باشو بەڵێنو پەیمان بوو لە بەرامبەر دراوسێکانی.

پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو هەرێمی کوردستان یەکێك لە گرفتە سیاسییەکانی پ.ك.ك بوو، هەریەك لە ی.ن.ك و پ.د.ك بۆچوونیان جیاواز بوو بەرامبەر پ.ك.ك. ، ئەویش بەم چەشنە بوو:

١-هەڵوێستی پ.د.ك، جوگرافیاو دابو نەریت ڕۆڵی تیادا دەبینی، بە واتایەکی تر سنووری چالاکی پ.ك.ك. لەگەڵ پ.د.ك.دا لەهەرێمی کوردستاندا، لەناوچەی بادینان بەیەك تێکەڵ دەبوون، لە رووی کۆمەلاّیەتیو شێوە زمان، زەمینەیەکی لەبار بوو بۆ گەشەکردنو فراوانبوونی پ.ك.ك، لە کاتێکدا کە پ.د.ك سەنگی جەماوەری لەو ناوچەیەدا بوو، کە گەشەکردنی جەماوەری هەرپارتێکی تری بە هەرەشە دەزانی. لەلایەکی ترەوە سنووری جوگرافیای هەرێمی کوردستان لەگەڵ تورکیا، لە سنووری دەسەلاّتی هێزی پێشمەرگەی پ.د.ك بەریەك دەکەوتن، لەم سۆنگەیەوە هاوپەیمانی سەربازی تورکیا بۆ لێدانی پ.ك.ك، زیاتر لەگەڵ پ.د.ك بەسوود تر بوو، وەك لەگەڵ هەر پارتێکی دیکەی هەرێمی کوردستان، بارزانی لەسەر داوای تورکیا لە کۆتایی مانگی فەبرایری١٩٩٢، سەرەتاکانی ئەم هاوپەیمانیەتەی دەرخست، کاتێك ڕایگەیاند پ.د.ك هیچ جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ پ.ك.ك. نییەو ڕێگە نادات لە خاکی هەرێمەوە هیچ جموجوڵێکی سەربازی دژی تورکیا ئەنجام بدات[1] .

٢- ی.ن.ك هەلوێستی جیاواز بوو لە پ.د.ك چونکە سەنتەری هێزی جەماوەریو پێشمەرگەی لە ناوچەی سۆران بوو، نە سنووری جوگرافی هەبوو لەگەڵ تورکیاو نە چالاکییەکانی پ.ك.ك لەناوچەیەدا بەهێز بوو، لەم خاڵەوە ی.ن.ك هێندەی پ.د.ك ئامادە نەبوو بۆ نواندنی هەڵوێستی توند لەدژی پ.ك.ك . لەم بارەیەوە تاڵەبانی لەبەرئەنجامی کۆبونەوەو سەردانی یەکەمی بۆ تورکیا ڕایگەیاند پ.ك.ك پارتێکی نیشتمانییە[2]، ی.ن.ك دەیویست هەرێمی کوردستان لە شەڕی نێوان تورکیاو پ.ك.ك بەدوور بگرێت، بۆ ئەم

---

1ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/٢٥ ، ١٩٩٢/٢/٢٦.

2علی سیدمان: معادلة غامضة جداً، مجلة شؤون ترکیة ، عدد ٢ ، ١٩٩٢، ل/٩.

مەبەستە نوێنەری خۆیان نارده لای سەرکردایەتیی پ.ك.ك لە دەشتی (البقاع) لە لوبنان‌و هەردوولا لەسەر ئەوە ڕێکەوتن هەرێمی کوردستان نەبێتە بنکەی هێرشەکانی پ.ك.ك لە دژی تورکیا، بەڵام دوو ڕۆژ دوای ئەم سەردانە عەبدوڵڵا ئۆج ئالان لە ڕاگەیاندنێکدا پ.د.ك و ی.ن.ك ی بە خائن ناو برد[1] .

بەڵام ستراتیجیەتی تورکیا لەم نێوەندەدا بریتی بوو لە هاریکاریکردن لەگەڵ بەرەی کوردستانی بۆ هەڵوێست وەرگرتن لە بەرامبەر پ.ك.ك، لەم بارەیەوە پ.ك.ك بەیاننامەیەکی لە ناوەڕاستی ئۆکتۆبەری ١٩٩١دا بڵاوکردەوە، کە لەکۆبونەوەیەکدا لەگەڵ تورکیا، بەرەی کوردستانی داوایان لێکراوە پ.ك.ك لە ناوچەی دەسەڵاتیاندا وەدەر بنێن، بەرەی کوردستانی ئەم داوایەی پەسەند کردووەو بەڵگەشی ئەوە بوو دوابەدوای ئەو داوایەی تورکیا تەنها لە پارێزگای دهۆك، ٢٦ ئەندامیان دەستگیر کراون[2] .

ئەم شێوە ستراتیژیەی تورکیا گورزوەشاندن بوو لە پ.ك.ك لەناو سنووری هەرێمی کوردستاندا، بەسوود وەرگرتن لەو بۆشایی دەسەڵاتەی لە ئەنجامی کشانەوەی سوپای عێراقی لە هەرێمەکەدا هاتبووە کایەوە، هاوکات بەرەی کوردستانی لە ڕووی دەسەڵاتی کارگێڕی‌و نیزامییەوە لاواز بوو کە توانای ئەوەی نەبوو ئاسایشی هەرێمی کوردستان لە دژی هەر چالاکییەکی نایاسایی بپارێزێت.

تورکیا لە ئۆگستۆسی١٩٩١دا یەکەم هێرشی زەمینی کردە سەر هەرێمی کوردستان، بە ناوی لێدانی بنکەکانی پ.ك.ك تا ناوچەکە نەبێتە جێگەی حەوانەوەو خۆڕێکخستنی ئەم پارتە لە دژی تورکیا. سەرەك وەزیرانی نوێ مەسعود یەلماز ڕایگەیاند هێڵێکی تەماس بە قووڵایی ٥کم و بە درێژایی سنووری هەرێمی کوردستان پێك دەهێنێت، بۆ هەموو کەسێك قەدەغەیە کە ئەوهێڵە ببەزێنێت. لەم هێرشەدا فڕۆکە جەنگییەکانی تورکیا بەشدار بوون، لەم بارەیەوە پ.د.ك ڕایگەیاند ئەو ناوچانەی سوپای تورکیا پێکاونی، شوێنی ئاوارەکان‌و بۆتە هۆی کوشتنی ١٨ سڤیل‌و لە نێوانیاندا ژن‌و منداڵ هەن[3] .

پ.ك.ك لە ناوچەی سنووری هەکاری لەگەڵ هەرێمی کوردستان، ١١ سەربازی تورکیای لە ڕێکەوتی ٩/ئۆکتۆبەر/١٩٩١دا کوشت، وەك پەرچەکردارێك تورکیا بە ٣ هەزار سەرباز لە ١٤/ئۆکتۆبەر/١٩٩١ سنووری بەزاند، تاڵەبانی لە ڕاگەیاندنێکدا بە تورکیا و سوریا و ئێرانی ڕاگەیاند، بەهیچ شێوەیەك دژایەتی یان پشتگیری پ.ك.ك لە هەرێمی

---

1کریس کۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوایەتییی کوردو هیوای سەربەخۆیی، بەرگی دووەم، ل/١٦٧.

Pkk-pak2:یا ابناء شعب كردستانی الوطنی،٢٢\١٠\١٩٩١، مجلة دەنگی کردستان ، عدد خاص، ١٩٩٢، ل/٧١-٧٢.

3کریس کۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوایەتییی کوردو هیوای سەربەخۆیی، بەرگی دووەم، ل/١٦٧.

کوردستاندا نەکەن، هەر بۆ هەمان مەبەست بارزانی ئامادەیی هێزی پێشمەرگەی کوردستانی دەرخست بۆ بەرگریکردن لە هەرێمی کوردستان لە دژی هێرشی تورکیا، لەم بارەیەوە سەرەك کۆماری لیبیا موعەمەر قەزافی لە نامەیەکدا بۆ تورکیا بە فەرمی نارەزایی خۆی دەربڕی کە لەیەك کاتدا تورکیا خۆی بە پارێزەری هەرێمی کوردستان دەزانێت‌و لەلایەکی تر هێرشبەرە، وەڵامی تورکیا بە شێوەیەك بوو کە کوردی هەرێمی کوردستان بۆ تورکیاو لە بەرامبەر پ.ك.ك یەکسان نین‌و هێرشەکان دژی تیرۆرستانە[1] . ئەم وتارە بەڵگەی روانگەو مامەڵەی جیاوازی تورکیا بوو لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، لە باکوورو هەرێمی کوردستان.

ستراتیژیەتی هێرشی تورکیا لە هەرێمی کوردستان سەرکوتکردن‌و لەناوبردنی پ.ك.ك بوو، بەڵام لەگەڵ هەموو هێرشێکدا تەکتیکێکی لەپشتەوە بوو، بەجۆرێك کاتی ئەم لە شکرکێشیە، رێکەوتی گەرموگوڕی دانوستانەکانی بەرەی کوردستانی بوو بە سەرۆکایەتیی بارزانی بۆ رێکەوتنی تەواوەتی لەسەر پرۆژەی ئۆتۆنۆمی لەگەڵ عێراق، کە تورکیا بە هەڕەشەی دەزانی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی خۆی‌و بە سەرنەکەوتنی ئەو دانوستانە دڵخۆش بوو، هەر بۆیە لەم بارەیەوە سەرەك ئەرکانی تورکیا لە میانەی هێرشە سەربازییەکەدا، رایگەیاند سوپای تورکیا ئامادەیە سزای توندی هەر بەرپرسێك بدات، لە هەر شێوەیەك بێت، ئەگەر کارو پیلان دژی وڵاتەکەمان بگێڕێت[2] .

---

1مسلسل الآحداث: مجلة ئالای ئیسلام ، عدد ٦ ، ١٩٩٢، ل/٣٣-٣٤ .

2 جیف سیموند: عراق المستقبل، ل/١٨٠.

## تەوەرەی دووەم

## پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا

## لە قۆناغی حکومەتی هەرێمی کوردستان

## لە ساڵانی ١٩٩٢-١٩٩٤

دوای ئەوەی حکومەتی عێراق دامودەزگا کارگێڕییەکانی لە ٢٦/ئۆکتۆبەر/١٩٩٢دا لە هەرسێ پارێزگای سلێمانیو هەولێرو دهۆك کێشایەوە، ئابڵوقەیەکی ئابووری توندی بەسەر هەرێمی کوردستاندا سەپاند، بەهۆیەوە بەرپرسیارییەکی گەورە کەوتە ئەستۆی بەرەی کوردستانی ئەویش بریتی بوو لە پاراستنی خەڵكو خاکی هەرێمەکەو بەڕێوەبردنیان بە شێوەیەکی سەربەخۆو دوور لە هیچ دەسەلاتێکی دەوڵەتی عێراقی.

ئەو هۆکارانەی حکومەتی عێراقی هاندا دەست لەهەرێمی کوردستان هەڵبگرێت، سەرنەگرتنی دانوستانەکان بوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی رژێمی عێراقی پرۆژەی "ئەرکەکانی بەرەی کوردستانی" خستە روو، بەو پێیە نابێت هیچ جۆرە هاریکاریو پەیوەندییەك لەگەڵ دەوڵەتانی ناوچەکە ئەنجام بدرێت، هەروەها دەبێت بەرەی کوردستانی لەژێر ئالای عێراقدا دژی سیاسەتی ئەمریکاو ئیسرائیلو ئێران بوەستێ، سەرەڕای ئەوەی دەزگای ئاسایش لە هەرێمی کوردستان دەبێت سەر بە دەسەلاتی ناوەندی بەغدا بێتو پێشمەرگە چەکە قورسەکانی بداتەوە دەست سوپای عێراق[1] .

لە ٢٨/ئەپریل/١٩٩٢ بەرەی کوردستانیو لیژنەیەك لە مافناسو دادوەران بڕیاری ژمارە ١ی ساڵی ١٩٩٢یان دەرکرد، تایبەت بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق، لە بڕیارێکی تر، یاسای هەڵبژاردنی ڕابەری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد دەرچوو، بەم پێیە لە ١٩/مایۆ/١٩٩٢دا دەنگدان بۆ ٧ * پارتی رکابەر لە هەرێمی کوردستان دەستی پێکرد، لە ٢٢/مایۆدا ئەنجامی هەڵبژاردنەکان دەرچوو، کە لە کۆی ١١١٢٠٠٠ کەس ٩٦٧٢٢٩ دەنگ درا، پ.د.ك ڕێژەی ٤٥,٠٥٪ و ی.ن.ك ڕێژەی ٤٣,٦٪ ی دەنگەکانی بەدەستهێنا، دواتر دەنگی پارتە سەرنەکەوتووەکانی هەڵبژاردن بەسەر هەریەك لەو دووپارتە دابەش کران، ڕێژەکە بوو بە ٥٠,٨٪ بۆ پ.د.ك و ٤٩,٢٪ بۆ ی.ن.ك،

---

1الاخبار، مجلة الاسبوع العربي ، عدد ١٦٥٥ ، تموز ١٩٩١ .

* ئەو پارتانەی بەشدارییان لە هەڵبژاردن کردبریتی بون لە: پ.د.ك، ی.ن.ك، بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستانی عێراق، پارتی سۆسیالیستی کوردستان، پارتی کۆمۆنیستی عێراقی، پارتی گەلی دیموکرتی کوردستان، دیموکراتی سەربەخۆ.

هەریەکەیان ٥٠ کورسییان لە پەرلەمان وەرگرت، ئاشوورییەکانیش ٥ کورسییان بۆ تەرخان کرا. ئەمەش سەرجەمی کورسیی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان بوو کە ١٠٥ کورسی بوو. لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکاندا حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ٤/ یۆلیۆ/١٩٩٢ بە سەرۆکایەتی محەمەد فوئاد مەعسوم پێکهات[1] .

هەرچەندە هۆشیار زێباری لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا، بە ناوی بەرەی کوردستانی بۆ هێورکردنەوەی هەڵوێستی تورکیاو دەوڵەتانی ناوچەکە، ئەوەی روونکردەوە مەبەست لە هەڵبژاردن پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ نییەو بەهیچ شێوەیەك نابێتە هەڕەشە بۆ دەسەڵاتی حکومەتی عێراق و تورکیا[2]، بەڵام هەڵوێستی تورکیا پێش هەڵبژاردنەکان کەوت، لە ١٣/مایو/١٩٩٢دا قسەکەرێك بە ناوی حکومەتی تورکیاوە رایگەیاند هەڵبژاردنەکانی کوردستان نەگونجاوە لەگەڵ سیاسەتی تورکیا بەرامبەر، عێراق و ناوچەکە[3] . لە بارەی پێکهێنانی حکومەتی هەرێمەوە لەدوای چوار رۆژ لە پێکهێنانی، تورکیا ئەو حکومەتەی بە ناشرعی دانا[4]، لەلایەکی دیکەشەوە چەند ئەندام پەرلەمانێکی تورکیا لە پارتی DP ئامادەی هەڵبژاردنەکە بوون لەوانە لەیلا زانا، ئەحمەد تورك، سەلیم سادق و چەند کەسایەتییەکی تر[5] ، لە ناوخۆی تورکیادا هەڵبژاردنەکان بەو شێوەیە بوو کە گۆڤاری ٢٠٠٠ ی تورکی بەمانشێتێکی گەورە نوسیبووی "لەدوای هەڵبژاردنەکانی باکووری عێراق، دەوڵەتی کوردی دادەمەزرێت"[6] .

لەم گۆشە نیگایەوە بوو تورکیا پەیوەندییەکی فەرمی لەگەڵ حکومەتی هەرێمدا نەدەکرد، بەڵکو لەڕێگەی نوسینگەی پ.د.ك و ی.ن.ك کە لە ساڵی ١٩٩١ وە بەناوی نوسینگەی بەیەکەوەبەستن-مکتب الارتباط ناسرابوو، پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەرێمی کوردستان رێکخستبوو[7]، بەڵام هەڵبژاردنەکانی کوردستان وەك توێژەرێك دەڵێت: دانپیانانی

---

1بۆ زانیاری زیاتر لە سەر ژمارەی دەنگی پارتەکان بڕوانە: مایکل میدو کروفت وزمیلە: أنتخابات البرلمان الكوردي في العراق وأنتخابات قائد الحركة التحررية الكردية، ترجمة ونشر مكتب الدراسات والبحوث المركزي، ١٩٩٧، ل/٣٢-٣٣.

2رودهۆفو نەوانی تر: هەڵبژاردنەکانی کوردستانی عێراق، ل/٤٥.

3فرسەت ئەحمەد عبداللەو ئەوانی تر: کوردستان دیموکراتیەت سیاسەت، چاپی سێیەم، چاپخانەی خەبات، هەولێر، ساڵی ٢٦٩٩ی کوردی، ل/٥٦.

4وقائع العلاقات بين تركيا ولاكراد، اعداد: محمد نورالدين، مجلة شؤن تركية ، عدد ٢ ، ل/١٣.

5رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/٩٥ ، ١٨/ ٥/ ١٩٩٢ .

6أخبار الكرد وكردستان: مجلة كردستان مجاهدة ، عدد ٢ ١٩٩٢ ل/٣٧.

7رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/١٣١٢ ، ١٨/ ٦/١٩٩٦ .

نێودەوڵەتیی بۆ خۆی پەیدا کردبوو، خۆی کرد بە بارێکی دیفاکتۆ بۆ ناوچەکە بەگشتیو تورکیا بەتایبەتی [1].

دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان بە هۆی هەڵبژاردنەکان خۆی کردە لایەنێکی سەرەکی لە سیاسەتی ناوچەییو نێودەوڵەتیی، بەڵام ئەم دەسەڵاتە لە بارێکی وادا نەبوو بێتە رکابەرو ململانێکاری دەوڵەتی تورکیاو بەهیچ پێوانەیەکی جیوپۆلۆتیکی لە رووی روبەرو پێگەو هێزو دانیشتوانەوە لەگەڵ تورکیادا بەراورد نەدەکرا، لەبەر هەموو ئەم راستیانە، حکومەتی هەرێمی کوردستان جگە لەپێکەوە ژیانو پەیوەندیی بەرامبەریو دوورتر لەوە ستراتیجی، هیچ هەڵبژاردنێکی سیاسیی تری لەبەرامبەر تورکیادا نەبوو.

دوابەدوای هەڵبژاردن تاڵەبانی گەیشتە تورکیاو کۆبونەوەکانی لەگەڵ سەرەك وەزیرانی تورکیا دیمیریل وەزیری دەرەوە حیکمەت چتین دەستیپێکرد، کە پەیوەندییە دوو لایەنەکانی بردە ئاستێکی تر، چونکە توانی دەرگای کەناڵەکانی کابینەی حکومەتی تورکیا بەڕووی هەرێمی کوردستاندا بکاتەوە، کە تا ئەو کاتە تەنها پەیوەندییەکان لە ئاستی ئاڵوگۆڕکردنی بیرو بۆچوون بوو لە نێوان سەرەك کۆماری تورکیاو سەرکردە کوردەکان. تەوەرەی سەرەکی لەم قۆناغە واتە لەساڵی ١٩٩٢-١٩٩٤ خۆی لەم چەند خاڵەدا دەبینێتەوە:

١- مانەوەی هێزی هاوپەیمانان لە تورکیا.

٢- کارئاسانکردن بۆ گەیشتنی یارمەتی مرۆییە بە هەرێمی کوردستان.

٣- هەڕەشەی رژێمی عێراق بۆ سەر هەرێمی کوردستان.

٤- کێشەی پ.ك.ك.[2]

تاڵەبانی لەم گەشتەیدا لە روانگەی هەڵبژاردنەکانی کوردستانەوە تەواوی هەوڵەکانی خستەگەڕ بۆ پێکهێنانی پەیوەندییەکی فەرمی لەنێوان هەردوولا[3] کەناڵەکانی راگەیاندن تاڵەبانی یان بە داڕێژەری پرۆژەی "فیدرالی" لەنێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا ناوبرد[4] لە بەرامبەردا سەرەك کۆمار ئۆزال، وەك پەیامێك بۆ سەرەك وەزیرانی نوێ بە دیمیریل ی رایگەیاند، تورکیا هەڵەیەکی گەورە دەکات گەر رووداوەکانی هەرێمی کوردستان بەهەند وەرنەگرێت، ترسو پشتگوێخستن لەم بارەیەوە هەڵەیەکی دیاری سەردەمی دەسەڵاتی تاکە

---

1 Ofra Bengio: Iraqi Kurds: Hour of Power?، thc middle East quarterly، Summer 2003و htm.

2ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە/١١٥ ،١١ / ١٩٩٢/٦.

3أصغر جعفر ولدانی: چشم داشت های ترکیا به شمال عراق، مجلة إطلاعات سیاسی إقتصادی ، شمارة ٩٨-٩٧ ، ل/٥٢-٥٣.

4دیڤد ماکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، ل/١٣١.

پارتیە[1]، وەك ئاماژەیەك بۆ سەردەمی حوكمی پارتی گەلی كۆماری ١٩٢٣-١٩٥٠ لە توركیا. سەرباری هەموو ئەمانە، ستراتیجی سیاسەتی دیمیریل لە پەیوەندییەكانی لە گەڵ هەرێم، مانایەكی مرۆیی‌و بەزەیی لەخۆگرت‌و جەختی لەسەر یارمەتییە مرۆییەكان كردەوە، ئەوەی خستە روو كە جیهان بەگشتی بە كارەساتی كێشەی كورد لە عێراق نیگەرانن‌و توركیا رێگە نادات جارێكی تر كارەساتی هەڵەبجە روویداتەوە[2] . بەڵام سەبارەت بە پەیوەندییە سیاسییەكان سلێمان دیمریل هیچ جۆرە وەڵامێكی نەبوو، سەرەڕای ئەوە، بەشداریكردنی وڵاتەكەی لە ئاوەدانكردنەوەی هەرێمەكە بەوە بەستەوە كە هەركاتێك بارودۆخی هەرێمی كوردستان جێگیر بێت‌و ئاشتی‌و ئاسایش بچەسپێت دوا جاریش مەترسی پ.ك.ك لە هەرێمدا كۆتایی بێت، ئەوكاتە حكومەتی توركیا كۆمەكی پێویست بۆ ئاوەدانكردنەوەی گوندو دێهات‌و شارۆچكەكانی كوردستان پێشكەش دەكات[3] .

ئەم وتارەی دیمریل ئاماژەی بە پێشكەشكردنی پرۆژەی رێكەوتنێكی توركی بۆ سەرمێزی دەسەڵاتی هەرێمی كوردستان كرد، ئەوەبوو لە دوای ماوەیەكی كەم، واتە لە ٦/ ئۆگستۆس/١٩٩٢ بەیاننامەیەك لەلایەن حكومەتی هەرێمی كوردستانەوە بڵاوكرایەوە، چەند خاڵێكی سەبارەت بە پ.ك.ك لەخۆ گرتبوو، گرنگترینیان ئەوەبوو، هێزەكانی پ.ك.ك رێگە لە جووتیارانی سنووری هەرێمی كوردستان لەگەڵ توركیادا دەگرن، هەروەها هەرێمەكەیان كردۆتە پێگەی پەلامار دژی توركیا، دواجار رێگە لەو بارهەڵگرانە دەگرن كە یارمەتی مرۆیی دەگەیەننە حكومەتی هەرێم[4]، لەم سەروبەندەدا بوو پ.ك.ك لەپای دەستگیركردنی ئەندامەكانیان لە دهۆك، لە ئابلۆقەیان شاری سلوپییەوە لەسەر هەرێمەكە دانا[5] .

لە سەرەتای سێپتەمبەری١٩٩٢، دوای گەڕانەوەیان لە گەشتێك بۆ دەوڵەتەكانی ئەوروپاو ئەمریكا، تاڵەبانی و بارزانی لەگەڵ سەرەك كۆمارو سەرەك وەزیران‌و وەزیری دەرەوەی توركیا كۆبوونەوە، پاشان هەردوولایەنی كوردی لە توركیا گەیشتن بە رێكەوتنێك لە حەوت خاڵ پێكهاتبوو، خاڵی چوارەم تایبەت بوو بە پ.ك.ك و تیایدا هاتووە "یەكخستنی هەڵوێست بە وتەو بە كردەوە لە راگەیاندن‌و رەفتارو كردار، بەرامبەر بە پ.ك.ك " لەمبارەیەوە بارزانی ئەوەی لە پەرلەمانی كوردستان باسكرد كە دەسەڵاتی كوردی

---

1رۆژنامەی كوردستانی نوێ: ژمارە/١٤١ ١٩٩٢/٧/١٧.

2رۆژنامەی كوردستانی نوێ: ژمارە/١١٥ ، ١٩٩٢/٦/١١ .

3رۆژنامەی كوردستانی نوێ: ژمارە/١٤٩ ، ١٩٩٢/٧/٢٤.

4رۆژنامەی كوردستانی نوێ: ژمارە/١٥٨ ، ١٩٩٢/٨/٦ .

5 كریس كۆچێرا: بزووتنەوەی نەتەوایەتییی كورد ل/١٦٧ .

فشارێکی گەورەی لەلایەن ئەمریکاو بریتانیاو فەرەنساوە لەسەرە، بۆ نەهێشتنی کاری چەکداری پ.ک.ک لە هەرێمی کوردستاندا[1]، هەموو ئەمانە ئەو راستیە ئاشکرا دەکەن پ.ک.ک کێشەیەکی سەرەکی بوو بۆ حکومەتی هەرێم. هەوڵەکانی پەرلەمانو بەرەی کوردستانی بۆ پابەندکردنی پ.ک.ک بە هێرش نەبردنە سەر تورکیا لە هەرێمەوە، لەگەڵیاندا، سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا[2] .

لە ٥/ئۆکتۆبەر/١٩٩٢دا هێزی پێشمەرگەی پارتەکان لە ژێر سایەی بەرەی کوردستانی کەوتنە شەڕەوە لەگەڵ پ.ک.ک و تا ٢٧/ئۆکتۆبەری خایاند، پاشان شەڕ بەتەواوی وەستا، بەرەی کوردستانی رایگەیاند، کە ١٠٠ پێشمەرگەی کوژراوە، پ.ک.ک. دانینا بە ١٥٠ کوژراوو حکومەتی تورکیا، کە سوپاکەی لەسەر سنوور مۆڵ دابوو، هەروەها ٨ فڕۆکەی ئاسمانی پشتیوانی هەوایی بۆ پێشمەرگە دابین دەکرد، دانینا بەوەی ٢٣ سەربازی لێ کوژراوە[3].

رێکەوتنی نێوان بەرەی کوردستانیو پ.ک.ک لەسەر ئاگربەست بەم شێوەیە بوو:

- گەریلاکانی پ.ک.ک بە چەکەکانیانەوە بچنە ئۆردوگای زەڵێ * نزیك سنووری ئێرانو پێویستە لەژێر چاودێری هێزی پێشمەرگەدا بن.
- نابێت بە هیچ جۆرێك پ.ک.ک چالاکی سەربازی بەرامبەر تورکیا لە خاکی هەرێمی کوردستانەوە ئەنجام بدات
- پ.ک.ک شەڕی راگەیاندن لە دژی سەرکردایەتیی هەرێمی کوردستان هەڵبگرێت[4] .

ئەم رێکەتنە مایەی رەزامەندی تورکیا نەبوو کە دەیخواست هێزی چەکداری پ.ک.ک بەتەواوی لە هەرێمی کوردستاندا نەمێننو چەکدارەکانیان لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە بدرێنەوە دەست تورکیا، بۆ ئەم مەبەستە سوپای تورکیا بە پێنج هەزار سەربازو لە ٢٩/ئۆکتۆبەر/١٩٩٢دا بۆ پێکانی ئامانجەکانیان بەرەو ناو خاکی هەرێم کشا، تا ١٥/نۆڤەمبەر/ ١٩٩٢ لە ناو خاکی هەرێمی کوردستاندا بوون[5]، لەلایەکی ترەوە تورکیا بۆ یەکەمجار دوو نوێنەری دیپلۆماسی نارده کوردستانو نامەی دیمیریل یان گەیاندە بارزانی و

---

1ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق: پرۆتۆکۆلەکان، بەرگی دووەم، ل/٤٤٥-٤٤٨ .

2 هەمان سەرچاوە، بەرگی سێیەم، ل/٢٣١- ٢٣٤.

3 کریس کۆچێرا :بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، ل/١٧٠-١٧١ .

* زەڵێ: گوندێکە سەر بەناحیەی هێرۆ، قەزای پشدەر ، پارێزگای سلێمانی، تەنها ٢کم لە سنووری ئێران دورە.

4 رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/٢٣١ ٢/١١/١٩٩٢ .

5رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/٢٤٢ ١٥/١٠/١٩٩٢.

تالەبانی، هەروەها لە نزیکەوە رەوشی جەنگو رێکەوتنی نێوانیان لەگەڵ پ.ك.ك تاوتوێکردو هەردووکیان بانگێشتی تورکیا کران[1] .

لە بەرامبەردا حکومەتی هەرێم لەسەر زاری سەرەك وەزیران محەمەد فوئاد مەعسوم لێدوانێکی دا کە ناوەرۆکەکەی ئەوەبوو، جەنگ لەگەڵ پ.ك.ك دا لە پێناوی نەهێشتنی بەهانەی هاتنە ناوەوەی سوپای تورکیا بووە بۆ ناو هەرێم، هەروەها ئەندامانی پ.ك.ك لە هەرێمی کوردستاندا پەنابەری سیاسینو بەپێی یاسای نێودەوڵەتی پەنابەری سیاسیی بە دەستەوە نادرێت، ئەمە جگە لەوەی نارەزایی حکومەتو پەرلەمانی لە هاتنە ناوەوەی سوپای تورکیا دەربری[2]، هەر لەم بارەیەوە رۆژنامەی کوردستانی نوێ هەواڵی کوژرانی ١٤ سڤیلو ٢٤ پێشمەرگەی لەسەر دەستی سوپای تورکیا بڵاوکردەوە[3] .

بارزانی و تالەبانی لە ١١/نۆڤەمبەر/١٩٩٢ لە شاری سلوپی کۆبونەوەیەکیان لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیا حیکمەت چەتین و جەنەراڵ ئەشرەف بەتلیسی و چەند بەرپرسێکی تر گرێدا، گەیشتنە رێکەوتنێك کە ٦٥-٧٠ بازگەی سەربازی بۆ پێشمەرگە لە سنووری هەردوولاو لەسەر بودجەی تورکیا بە درێژایی ٣٠٠ کم دامەزرێنن، هەر بازگەیەك ١٠٠ پێشمەرگەی تیادا بێتو بە ئامێری بێتەل پەیوەندیی لەنێوان بازگەکانو هەردوولایەنی هەرێمو تورکیا هەبێت. دەبێت ئەم رێکەوتنە تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٣ بەردەوام بێت[4] .

ئەم جەنگە چەند ئامانجێکی لێکەوتەوە کە گرنگترینیان:

أ.تورکیا رۆژ دواوی رۆژ زیاتر لەو راستییە نزیك دەبووەوە کە هەرێمی کوردستان دەسەڵاتێکی دیفاکتۆیە، کێشە سنوورییە دێرینەکانی نێوان تورکیاو عێراق پێویستە لەگەڵ دەسەڵاتی کوردیدا چارەسەر بکرێن بە شێوازێکی کوردی-تورکی نەك عەرەبی عێراقی-تورکی، هەرچەندە لەم پەیوەندییە سەربازییەدا بۆ تورکەکان راستییەکی تاڵ بوو، بۆ نموونە بولنت ئەجەڤیت لە پەرلەمانی تورکیا رایگەیاند: "کارەساتێکی گەورەیە، ئەوەی پێشمەرگە لە لێدانی پ.ك.ك پێی دەکرێ، تورکیای مەزن پێی ناکرێ"[5] .

---

1رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/٢٣٦ ٨/١١/١٩٩٢ .

2رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/٢٣٢ ٣/١١/١٩٩٢ .

3رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/٢٣١ ، ٢/١١/ ١٩٩٢ . رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە/٥٣٦ ،٨/١١/١٩٩٢ .

4 ماذا بعد انتهاء العملية العسكرية في شمال العراق، اعداد: محمد نورالدين، مجلة الشؤون تركية ، عدد ٤ ، ل/٩.

5 تركيا واعلان الدولة الكردية في الشمال العراق، النفط مقابل الغذاء، اعداد: محمد نورالدين، مجلة الشؤون تركية ، عدد ٢ ، ل/٤

ب. بايەخی ئەم ڕێکەوتنە بۆ تورکیا لەوەدابوو، زامنی ئەوەیکرد، دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان، خاوەنی ئاسایشی نەتەوەیی تایبەت بە خۆیەتی‌و خواستی پاراستنی هەیە لە دژی هەر هێزێك، ئەگەر چی ئەو هێزە کوردی بێت، هەروەها یارمەتیی کوردی باکوور نادات لەناو خاکی هەرێمەوە گورز لەتورکیا بدەن، بۆیە بوونەتە ڕێگر لەبەردەم هەر پێگەیەکی چەکداری پ.ك.ك، هەروەها بۆچوونێکی خراپی دانیشتوانی هەرێم لەسەر پ.ك.ك پەیدا بوو.

ت. دیپلۆماسیەت‌و دەسەڵاتی کوردی سەرکەوت، کە لەلایەك توانی تورکیا بخاتە ژێر باری ڕێکەوتنی دوو لایەنەی بەرامبەری، لەلایەکی تریشەوە توانی دەروازەی مانەوەو بەردەوامبوونی ژیانی ئابووری‌و سیاسیی هەرێمی کوردستان دابین بکات، لێرەوەو ساڵ بەدوای ساڵ بزووتنەوەی بازرگانی لە نێوانیاندا گەشەکردنی بەخۆوە بینی.

پ. هەروەها تورکیا لە ئۆگستۆسی١٩٩٣دا بڕی ١٣,٥ ملیۆن دۆلاری پێشکەش بە حکومەتی هەرێم کرد[١] .

ج. لەگەڵ ئەوەی جەنگی پ.ك.ك لەگەڵ هەرێمی کوردستان بە هاوکاریی دوژمنێکی دێرینی وەك تورکیا، دەنگدانەوەیەکی نێگەتیفی ڕای جیهانی لەسەر دەسەڵاتی کوردی هەبوو[٢]، چونکە لەو کاتەدا پ.ك.ك و کێشەی کورد لە تورکیا، شەقامی ڕۆژئاوای بۆ خۆی کێشکردبوو.

زنجیرە ڕووداوەکانی هەرێمی کوردستان، یەك لەدوای یەك مایەی شۆك بوون بۆ تورکیا، چونکە لەکاتێکدا هێزی پێشمەرگە لە خۆئامادەکردندا بوو بۆ جەنگ لە دژی پ.ك.ك، هاوکات ٢٣٤ کەسایەتی عێراقی لە هاوینەهەواری سەلاحەدین ی پارێزگای هەولێر، دوای کۆبونەوەیەکی دوو ڕۆژی سەبارەت بە ئایندەی عێراق، لە ٢٧ی سێپتەمبەر١٩٩٢دا کۆنگرەی نیشتمانی عێراق INCیان پێکهێنا[٣]، دواتر لە ٤/ئۆکتۆبەر/١٩٩٢ پەرلەمانی کوردستان جاڕنامەی فیدراڵی وەك سیستەمێك بۆ داڕشتنی پەیوەندیی نێوان هەرێمی کوردستان‌و دەسەڵاتی ناوەندی عێراق ڕاگەیاند[٤] .

هەڵوێستی تورکیا لەم بارەیەوە لە ٨/ئۆکتۆبەردا بریتی بوو لە:

- بڕیاری ڕاگەیاندنی فیدراڵی لەلایەن کوردەوە یەك لایەنەیە.

---

1 الموقف العربي من تطورات المسألة الكردية في العراق، الموقف التركي www ALMqAtl.com

2Kevin kuswa: the Kurds a Way: Kurdistan and the Discourse of the Nation-State. www.tamilnation.org/index.htm

3علي الشمراني: صراع الاضداد، ل/٢٥٨– ٢٦٣.

4ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق: پرۆتۆکۆلەکان، بەرگی سێیەم، ل/٢٠٢.

- ئەم بڕیارە پێدەچێت عێراق دابەش بکات.
- بڕیارەکە گونجاو نییە، کاریگەریی هەیە لەسەر ئاشتیو ئاسایشی ناوچەیەك کە بەرەوڕووی کێشەیەکی گەورە بۆتەوە.
- ئەم پرۆژەیە لە بەرژەوەندی کورد نییە لە عێراقدا.
- پارێزەرو زامنی یەکەمی ئاسایشی هەرێمی کوردستان بە کوردو عەرەبو تورکمانو ئاشورییەکان، دەوڵەتی تورکیایە.

لەم بارەیەوە ئۆزال هیچ ڕاگەیاندنێکی فەرمی نەبوو، دیمیریل لەم ڕێکەوتەدا ئەوەی خستە روو کە "کوردی عێراق تا ئێستا بەشێکن لە عێراقو عێراقیش دراوسێی تورکیایە"، بولنت ئەجەڤیت مەترسییەکی گەورەی هەبوو، وتی: "ئەمە هەنگاوێکە بۆ دابەشبوونی عێراق بۆ سێپارچە، بە دوایدا دابەشبوونی تورکیا دێت"، ئەربەکان فیدراڵی بە زیانی بەرژەوەندییەکانی تورکیا ناساند، بە سیاسەتی ئەمریکی دژ بە تورکیا ناوی برد[١] .

لە کۆی ئەم هەڵوێستو وتارە سیاسیانەدا دەرکەوت فیدراڵیەتی هەرێمی کوردستان لە گۆشەنیگایەوە لێکدراوەتەوە کە بەدەستهێنانی هەر مافێکی سیاسیی کورد لە دوارۆژدا دەبێتە دابەشبوونی تورکیا، لەم بارەیەوە سلێمان دیمریل لە ٢٦/ئۆکتۆبەر/١٩٩٢ سەردانی ئێرانی کرد بۆ کۆبوونەوەو ڕێکەوتن لەسەر شێوازی گونجاو سەبارەت بە ڕێگرتن لە سەربەخۆبوونی کوردو پاشان دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەسەلاتی کوردیدا، بۆ ئەم مەبەستە دوور لەهەموو ئەو جیاوازیو ناکۆکیانەی نێوانیان لە ١٤و١٥/نۆڤەمبەر/١٩٩٢دا کۆبونەوەی وەزیرانی دەرەوەی تورکیاو ئێرانو سوریا لە ژێر ناوی کۆبونەوەی سێ لایەنە بەسترا و لەسەر چەند خاڵێك ڕێکەوتن:

أ.بەرهەڵستیکردنی دابەشبونی عێراقو پاراستنی یەکێتییو سەروەری ئەو دەوڵەتەو ڕەتکردنەوەی فیدراڵی.

ب. هەر هەوڵێك لەپێناو دابەشبونی عێراقدا ئەنجامی ترسناکی لەسەر ئاشتیو سەقامگیربوونی ناوچەکە دەبێت.

ت. داهاتووی عێراق، گەلی عێراق بڕیاری لەسەر ئەداتو INC نوێنەری تەواوی گەلی عێراق نییە[٢] .

---

1ترکیا واعلان الدولة الکردیة فی شمال العراق، النفط مقابل الغذاء، اعداد:محمد نورالدین، مجلة الشؤون ترکیة ، عدد ٢ ، ل/٣-٤.

2تطورات المسألة الکردیة فی العراق والترکیا، مجلة شؤون ترکیة ، اعداد: محمد نورالدین، عدد ٣ ، ١٩٩٢، ل/٢٣.

ئامانجی کۆبونەوەی سێ لایەنە بەشێوەیەکی سەرەکی هەرێمی کوردستان بوو لە عێراق، بەڵام بە پشتگوێخستنی مافی چارەنوسی دانیشتوانی هەرێم، هەروەها بانگهێشت نەکردنی نوێنەری عێراق، وایکرد بڕیارەکانی لەسەر هەریەك لەم دوو لایەنە، وەك پەیوەندیداری سەرەکی لە پرسەکەدا، هێزی جێبەجێکردنی لەسەر ئەم دوولایەنە نەبێت. لەلای خۆیانەوە هەرسێ دەوڵەت لەسەر ئەوە رێکەوتن، شەش مانگ جارێك کۆبونەوە ئەنجام بدەن‌و پرس‌و راوێژ بە یەکتر بکەن، لەم بارەیەوە لەسەر ئەوە کۆك بوون، مامەڵەو پەیوەندیی بە شێوەیەکی لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان لە هیچ بوارێکی سیاسیی‌و ئابووری‌و لایەنەکانی تر، نەکەن[1].

پەرلەمانی کوردستان لە ئەنجامی ئەم کۆبونەوەیەدا نامەیەکی بۆ وڵاتانی تورکیاو ئێران‌و سوریا نارد، ناوەڕۆکەکەی ئەم خاڵانەی لەخۆ گرتبوو:

- هەڵبژاردنی پەرلەمان، لە ئەنجامی کشانەوەی دەزگا کارگێڕییەکانی رژێمی عێراق بوو.
- حکومەتی کوردستان دەست ناخاتە کاروباری وڵاتانی دراوسێ، پێی باشە کێشەکانی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا بە رێگای ئاشتی چارەسەر بکات.
- فیدراڵی کوردستان، عێراق پارچەپارچە ناکات بەڵکو پاراستنی یەکێتیی عێراق دەپارێزێت[2].

رێگوزەری رووداوە ناوخۆیی‌و ناوچەییەکان لەم ماوەیەدا لە بەرژەوەندی هەرێمی کوردستان بوو، تاڵەبانی بۆ دۆزینەوەی رێگە چارەیەك بە شێوەیەکی گشتی لە نێوان کوردو تورکدا، پەیوەندیی کەسایەتی خۆی لەگەڵ ئۆزال لەلایەك‌و ئۆج ئالان لەلایەکی تر بەکارهێنا، هەردوولای لە ژێر کاریگەری زەرەرو زیانی جەنگی نێوان کوردو تورك، بۆ گفتوگۆ ئامادە کرد، تاڵەبانی لە نامەیەکدا بۆ ئۆزال لە ٥/مارت/١٩٩٣ رایگەیاند، کە ئۆج ئالان ئامادەیی خۆی بۆ دانوستان بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەربڕیوە:

أ.ئیدانەکردنی تیرۆر بە هەموو جۆرەکانیەوە.

ب. چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان هەردوو گەلی برا، کوردو تورك بە شێوازێکی سیاسیانە، نەك بە رێگەی پەنابردنە بەر شەڕو توندوتیژی.

ت. ئامادەبوون بۆ گفتوگۆکردنی ئاشتییانەو وەستاندنی چالاکیی سەربازی.

---

1الموقف العربي من التطورات المسألة الكردية 1 www. Almqatl.com .

2ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان: پرۆتۆکۆلەکان، بەرگی پێنجەم، ل/١٧٢.

پ. عەبدوڵڵا ئۆج ئالان داوای ئەنجامدانی دانوستان ناکات لە نێوان حکومەت پارتەکەی، بەڵکو پێی باشە حکومەتی تورکیا لەگەڵ ئەندامە کوردەکانی پەرلەمانی تورکیا گفتوگۆ بکات.

ج. پاراستنی یەکێتیی خاکی تورکیاو بایەخ دان بە پتەوکردنی برایەتیی نێوان هەردوو گەلی کوردو تورك.

ح. رەتکردنەوەی دروشمی جیابوونەوەو پەسەند کردنی دروشمی دیموکراسی کە لە سایەیدا مافی مرۆڤو رۆشنبیریو کارگێڕی بۆ کورد پارێزراو بێت.

خ. داوای پیادەکردنی چالاکیی سیاسییو حزبایەتی دەکات لە سنووری دیموکراسیو یاسادا[1] .

تاڵەبانی لە نامەکەیدا ئامادەیی خۆی بۆ نێوانکاری دەربڕی، بۆ هەمان مەبەست سەردانی تورکیای کردو چاوی بە سەرەك کۆمارو سەرۆکی حوکمەتو سەرۆك پەرلەمان کەوت، بە شێوەیەکی گشتی رەزامەندییان لەسەر پرۆژەکەی دەربڕی، هەروەها ئەمریکاو فەرەنساش پشتگیری خۆیان بۆ پیشان دا[2] .

لە ١٧/مارت/١٩٩٣دا ئۆج ئالان لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنووسیدا لە ناوچەی البقاع لە لوبنان، ئاگربڕی بۆ ماوەی ٢٥ رۆژ راگەیاندو جگە لەو خاڵانەی کە لە پرۆژەکەی تاڵەبانیدا هاتبوو داوای مافی نەتەوەی کوردی کرد لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی فیدراڵی لە تورکیادا. جاری دووەم ئەم ئاگر بەستە لە ١٦/ئەپریل/١٩٩٣ بە ئامادەبوونی تاڵەبانیو چەند سەرەك پارتێکی کوردستانی باکوورو ئەحمەد تورك وەك ئەندام پەرلەمانی تورکیا، ئاگر بەستەکە درێژکرایەوە[3] .

هەرچەندە حکومەتی تورکیا بە ئاشکرا رایگەیاند گفتوگۆ لەگەڵ تیرۆرستدا ناکەن، بەڵام ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا لە ١/ئەپریل/١٩٩٣ بە ئامادەبوونی ئۆزالو دیمیریل و سەرەك ئەرکانی سوپا، چەند بڕیارێکیان بە ناوی پیلانی کوردی حکومەت دەرکرد، تیایدا ئاماژە بە چەند خاڵێکی گرنگ کرابوو لەوانە: راستکردنەوەی یاسای لێبوردن بە شێوەیەك ئەندامانی پ.ك.ك بگرێتەوەو رەتکردنەوەی باری نائاسایی لە چەند پارێزگایەكو زیادکردنی

---

1رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/٣٣٧ ، ٢١/ ٣ / ١٩٩٣.

2 مام جلال: شەڕی پارتیو پەکەکە شەڕی پارتییە لەگەل کوردستانا باکوور، گوڤاری سەرهەڵدان ، ژمارە/١٥ ، ل/١٦-١٧.

3 pkk عشرون عاما، مجلة شؤون ترکیة ، اعداد: محمد نورالدین، عدد ٨ ، ١٩٩٣، ل/٤٠ .

دەسەڵاتی پارێزگاکانو بەهێزکردنی وەبەرهێنان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیاو چەند بڕیارێکی تر[1] .

ئەمە کاردانەوەیەکی باشی دەوڵەتی تورکیا بوو لەژێر کاریگەری پرۆژەی دانوستاندا، کە کاریگەری لەسەر باکووری کوردستانیش هەبوو، لە ناوخۆی تورکیاشدا بۆ یەکەم جار لە ئەنقەرە، ١٥٠ کەسایەتیو چەند کەسایەتییەکی تورك لە ١٢/ئەپریل/١٩٩٣دا بە ئامادەبوونی تاڵەبانی کۆبونەوەیەکیان کردو ئاشتی نێوان دەوڵەتو پ.ك.ك تاوتوێ کراو پشتگیری خۆیان بۆ دەربڕی[2] . هەروەها لە دەرەوەی تورکیا پارتە کوردییەکانی کوردستانی باکوور، بەرەیەکی کوردستانییان پێکهێنا، پ.ك.ك و پارتی سۆسیالستی کوردستان و هەڤگرتن و پارتی ڕزگاریخوازی کورد تیایدا بەشدار بوون، بە هەمان شێوە لە نێوان پ.ك.ك و ی.ن.ك لە سەر نوسراوێکی لێك تێگەیشتن ڕێکەوتن[3] .

ئاگر بڕی نێوان پ.ك.ك و حکومەت لە ٨/یولیۆ/١٩٩٣ کۆتایی پێهات، ئۆج ئالان جەنگی سەرتاسەری دژی دەوڵەتی تورکیا ڕاگەیاند، لە ئەنجامی چەند هۆکارێك لەوانە مردنی ئۆزال لە ١٧/ئەپریل/١٩٩٣، کە پشتیوانی سەرەکی پرۆژەی ئاشتی بوو لەناو دەوڵەتی تورکیا، لەجێگەیدا دیمیریل لە ١٦/مایۆ/١٩٩٣دا بوو بە سەرەك کۆماری تورکیاو لەگەڵ خۆیدا چەندین کەسایەتی کۆنەپارێز لە ناوەندی دەسەڵاتدا بڕیاری دەوڵەتیان کەوتەدەست، کە لایەنگری پرۆژەی ئاشتی نەبوون. دیارترین هۆکاری دەست پێکردنەوەی توندوتیژی، کوشتنی ٣٣ سەربازی بێ چەك بوو لەلایەن شەمدین ساکیك ی سەرکردەی پ.ك.ك، لە ٢٥/مایۆ/١٩٩٣دا. ئەم ڕووداوە سەرکردە سەربازییەکانی تورکیای هاندا زنجیرەیەك کاری سەربازی لە دژی سەنگەرەکانی پ.ك.ك و ئەندامەکانیان دەست پێبکەن[4]، کە کۆتاییان بە ماوەی ئاشتی نێوان هەردوولا هێنا.

لەگەڵ ئەوەی پرۆژەی ئاشتی تاڵەبانی سەری نەگرت، بەڵام ئەو باوەڕەی سەلماند کە گەشەکردنو بەرەو پێشەوە چوونی دۆسیەی کورد لە هەر پارچەیەك، کاریگەری دەبێت بۆ پارچەکانی تری کوردستان، هەروەها ئەم پرۆژەیە گشتاندنی بیری فیدرالی باشوور بوو بۆ باکووری کوردستان کەوەك ڕێگە چارەیەکی کێشەی کورد دەکرێت تورکیا سوودی لێ وەربگرێت. لێرەدا ئەو گریمانەیە دێتە پێش، لە بارێکدا پرۆژەکە سەرکەوتنی بەدەست

---

1المسألة الكردية فى تركيا امل وخيبات : مجلة شؤون تركية ، اعداد:محمد نورالدين، عدد ٨ ،١٩٩٣، ل/٣١ .

2 رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە/٣٦٣ ، ١٣ / ٤ / ١٩٩٣.

3المسألة الكردية فى تركيا امل وخيبات، ل/٣٣.

4المسألة الكردية فى تركيا امل وخيبات، ل/٣٢-٣٣ .

بهێنایه، ئەوا بیری فیدراڵی ئۆزال و تاڵەبانی نەخشەی پێکهاتەی سیاسیی ناوچەکەی دەگۆڕی.

هۆکارێکی کاریگەری دیکەی پەیوەندییەکان، مانەوەی هێزی هاوپەیمانان بوو لە تورکیا، کە هەمیشە تورکیا وەك فشار لە بەرامبەر هەرێمی کوردستان، بەکاری دەهێناو بەردەوام لەگەڵ نزیك بوونەوەی ماوەی کۆتایی هاتنی مانەوەی هێزەکە، چارەنووسی هەرێمی کوردستانی دەخستە بەر هەڕەشەی ئەگەری دەنگدانی پەرلەمانی تورکی سەبارەت بە مانەوە یان ڕۆیشتنی ئەو هێزە لەسەر خاکی تورکیا کە سەرەکیترین کۆڵەکەی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان بوو بە شێوەیەکی گشتی لەم ماوەیەدا ١٩٩٢-١٩٩٤ پەرلەمانی تورکی بەسەر دوو رای جیاواز دابەش بوو، یەکەمیان لەلایەن پارتە بەرهەڵستکارەکانی حکومەت کە ئەربەکان و ئەجەڤیت سەرۆکایەتیان دەکرد، لەو باوەڕەدا بوون، ئەو هێزە گەلێك پاشماوەی سلبی هەیە لەوانە، سەروەریی خاکی تورکیا پێشێل دەکات، بەهۆی ئەو هێزەوە بۆشاییەکی دەسەلات لە هەرێمی کوردستاندا پەیدا بووەو پ.ك.ك بۆ دژایەتیکردنی تورکیا سوودی لێ وەرگرتووە، هەروەها ئەو هێزە بووە بە لەمپەر لەبەردەم پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو عێراق، دواجار ڕێگە بۆ دروستبوونی دەوڵەتی کوردی خۆش دەکات[1] .

ڕوانگەیەکی تر گوزارشتی لە رای پارتە بەشداربووەکانی حکومەت دەکرد بۆ مانەوەی هێزی هاوپەیمانان، وەزیری دەرەوەی تورکیا لە ١٤/دیسەمبەر/١٩٩٢ لە پەرلەماندا سوودەکانی ئەوهێزەی لە چەند خاڵێکدا خستە روو لەوانە: ئەو هێزە ڕێگرە لە بەردەم دووبارە ئاوارەبوونێکی بە کۆمەڵ بۆ ناو تورکیا، بە هۆی ناوچەی پارێزراو لەلایەن هاوپەیمانانەوە، سوپای تورکیا لەگەڵ سوپای عێراق بەرامبەر یەکتر ناوەستنەوە، هاوکات یارمەتیی سوپای تورکیا دەدەن لە جەنگی دژی پ.ك.ك و لە کۆتاییدا مەترسی تورکیا زۆر گەورەتر دەبێت، ئەگەر ئەو هێزە لە دەوڵەتێکی دیکە نیشتەجێ بێت. ئەم پێشنیارانە لە کۆی ٣٩١ ئەندامی ئامادەبوو لە پەرلەمان، ٢٤٣ دەنگی بەدەست هێناو ١٥٧ دەنگ لە دژی پێشنیارەکە بوون، بەمەش ئەو هێزە مانەوەی خۆی درێژکردەوە[2] . ئەم دووڕا جیاوازە لە هەموو شەش مانگ جارێکدا سەری هەڵدەدایەوە، هەمیشە زۆرینەی ئەندام پەرلەمانەکان لەگەڵ رای دووەمدا بوونو هێزەکە مانەوەی خۆی مسۆگەرکرد.

---

1 قوة المطرقة تهديد وهواجس: مجلة شؤون تركية ، اعداد: محمد نورالدين، عدد ٥ ، ١٩٩٣، ل/٩ .

2 هەمان سەرچاوە، ل/١٢ .

# تەوەرەی سێیەم

# پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا

# لە قۆناغی یەکەمی شەڕی ناوخۆ

# ١٩٩٤-١٩٩٦

پەیوەندییە دەرەکییەکانی هەر دەوڵەتێك لەژێر کاریگەری گۆڕانکارییەکانی ناوخۆدایە، لێرەوە هەرێمی کوردستانو تورکیا دوولایەنە لە ناوخۆدا بەرەوڕووی چەندین گرفت بوونەوە، کە کاریگەرییان لەسەر روخساری دەرەکی پەیاکردو رەنگدانەوەییان لەسەر جۆری پەیوەندییە دوو لایەنەکان بەجێهێشت.

تورکیا دوای مردنی ئۆزال تووشی قەیرانی هەڵبژاردنی سەرەك کۆمارو سەرەك وەزیران بوو، دیمریل لە ئەپریلی/١٩٩٣ بۆ ماوەی حەوت ساڵ پۆستی سەرەك کۆماری وەرگرت، جیاواز لە ئۆزال لە بەرامبەر کێشەکانی دەوڵەت چارەسەری نوێی پێنەبوو، بەڵکو هەموو هەوڵێکی لە پێناو راگرتنی بارودۆخەکە بوو، نەك دۆزینەوەی رێگەچارە بۆ گرفتەکان[1]، تانسۆ چیلەر ئەو ئافرەتە بوو لە دوای دیمریل سەرکردایەتیی پارتی رێگای راست ی گرتەدەستو لە پەرلەماندا وەك سەرەك وەزیران لە بەرواری٢٠/یۆنیۆ/١٩٩٣ هەڵبژێردرا، گەورەترین گرفتێك کە لە ناوخۆدا بەرەوڕووی بووەوە کێشەی بێکاریو هەڵاوسان بوو، ئەوە بوو لە ئەنجامدا هاوپەیمانانی حکومەت، پارتی گەلی کۆماری پاشەکشەی کردو لە دوای ئەوە حکومەت لە ٢٠/سێپتەمبەر/١٩٩٥ هەڵوەشایەوە، لەم رێکەوتەوە تا ٢٩/ئۆکتۆبەر/ ١٩٩٦، حکومەتەکانی تورکیا تەمەنیان چەند مانگی بوو[2] .

ئەم گۆڕانە سیاسییانە کاریگەری تەواویان لەسەر هەرێمی کوردستان هەبوو، چونکە چەند کەسایەتیەکی بە رەگەز کوردو هاوسۆز لەگەڵ کوردا، لە دەسەڵات دورکەوتنەوە دیارترینیان ئۆزال بوو، کە وەك تاڵەبانی دەڵێت "بە مردنی، کورد دۆستێكو پشتیوانێکی گەورەی لە دەستدا"[3]، هەروەها لە ١٧/فبرایەر/١٩٩٣دا جەنەڕاڵ ئەشرەف بەدلیسی، ئەندازیاری رێکەوتنی سەربازی سنووری نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا، لە رووداوی کەوتنەخوارەوەی

---

1 الأمن القومی الترکی فی منظور الاوزالی، ترکیا بین عامین، تقویم سایان دیمیریل، مجلة شؤون ترکیة ، اعداد: محمد نورالدین، عدد ٥ ، ١٩٩٣، ل/٣٠-٣٥.

2 جلال عبداللة معوض: صناعة القرار فی ترکیا، ل/٥٠ .

3 رۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/٥٣٣ ،١١/١١/١٩٩٣ .

فرۆكە گیانی لەدەست دا، ئەو رێكەوتنەی بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێك هەرێمی كوردستانی لە دەستێوەردانی سەربازی توركیا پاراست[1]، دواجار دەستكێشانەوەی حیكمەت چەتین لە پۆستی وەزارەتی دەرەوە لە مانگی یولیۆ/١٩٩٤دا كاریگەری خۆی هەبوو، كە لەلایەن سوپای توركیاوە بە سینەفراوان لە بەرامبەر كێشەی كورد وەسف دەكرا[2].

لەگەڵ ئەو گۆڕانە كارگێڕییانەدا سیاسەتی حكومەتەكانی توركیا بەرامبەر هەرێمی كوردستان ناجێگیری‌و وەرچەرخانی پێوە دیاربوو لە كۆتایی حكومەتی دیمیریل دا، لە ١٣/ ئەبریل/١٩٩٣ شاندێك بە سەرۆكایەتیی تۆغای تولوچیك، یاریدەدەری كاروباری سیاسیی وەزیری دەرەوەی توركیاو ١٧ ئەندامی وەزارەتە جۆراوجۆرەكان رویانكردە هەرێمی كوردستان، لە كۆتایی گەشتەكەیاندا راپۆرتێكیان دایە دەست حكومەت، بۆ پێكهێنانی تەواوی هاریكاری سیاسیی‌و ئابووری لەگەڵ هەرێمی كوردستان، رۆژنامەی میللییەت ی توركی بە سیاسەتی "چوونە ناوەوەی تەواو" لەبری "گریان‌و بەزەیی" لە قەڵەم دابوو[3]، بەڵام لە سەردەمی حكومەتی نوێی چیلەر، وەك چارەسەرێك بۆ تەنگژە ئابوورییەكان*، دەستیكرد بە بانگەشەكردن بۆ رێكخستنەوەی پەیوەندی لەگەڵ عێراقدا، لە ١٤/ ئەبریل/١٩٩٤، بریكاری وەزارەتی دەرەوە ئوزدەم سنجرال لە بەغداد، بە فەرمی دانوستانی لەم بارەیەوە لەگەڵ بەغداد بۆ پێكهێنانەوەی پەیوەندیی بازرگانی‌و پیشەسازی‌و بەگەڕخستنەوەی بۆرییە نەوتییەكان دەست پێكرد[4]، توركیا لای خۆیەوە یەكلایەنە هەوڵەكانی خۆی لە پێناوی لابردنی گوشاری ئابووری لەسەر عێراق خستەگەڕ[5].

لەلایەكی تریشەوە دیپلۆماسییەتی حكومەتی عێراق لە پێناوی راكێشانی توركیا بەلای خۆیدا هەوڵەكانی خۆی بۆ لابردنی گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق چڕكردەوە، هەر لەم پێناوەدا نوێنەری عێراق لە توركیا رافع دحام پەیوەندی لەگەڵ ئەربەكان و ئەجەڤیت پتەو كرد، وەك دوو بەرهەڵستكاری سەرەكی لە پەرلەماندا، بۆ فشار خستنەسەر حكومەتی

---

1لماذا لایمكن حل قضیة أشراف بتلیس؟ مجلة شؤون تركیة ، مركز كردستان للدراسات الأستراتیجیة، عدد ١ ، ١٩٩، ل/١٥.

2روبرت اولسن: المسأله الكردیه، ل/٦٦.

3رۆژنامەی كوردستانی نوێ ژمارە/٣٦٣ ، ١٩٩٤/٤/١٤" سیاسة تركیة جدیدة فی شمال العراق، مجلة شؤون تركیة ، اعداد: محمد نورالدین، عدد ٨ ، ل/٤١-٤٢.

* رێژەی بێكاری لەسایەی سیاسەتی تانسۆ چیلەر ، بۆ ساڵی ١٩٩٤دا گەیشتە ١٩,٦٪ ،هەروەها بەرهەمی نەتەوەیی بەرێژەی ١٣,٤٪ لەگەڵ ساڵی پێشتر ١٩٩٣ بەرەودوا پاشەكشەی كرد.

4 جریدة الثورة : عدد ٨٥٤١ ١٩٩٤/٤/١٥ .

5 الوقائع السیاسة، مجلة شؤون تركیة ، اعداد: محمد نورالدین، عدد ٩ ، ١٩٩٣.

چیلەر، نەك تەنها بۆ لابردنی گەمارۆی ئابووری، بەڵكو بۆ دەركردنی هێزی هاوپەیمانان لە توركیاو گەڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی بەغداد بۆ هەرێمی كوردستان[1] .

هەڵوێستی نوێی توركیا بەرامبەر عێراق لەگەڵ كۆتایی هاتنی رێكەوتنی سەربازی نێوان هەرێمی كوردستانو توركیا لە ساڵی ١٩٩٤ هاوكات بوو، توركیا رایگەیاند چیتر بۆ پارێزگاریی سنوور پێویستیان بە هێزی پێشمەرگەی كوردستان نییە، لە بەرامبەردا هێزی پێشمەرگە سنوورەكانی چۆڵ كرد، هەر لێرەوە بۆشاییەك دروست بوو كە پ.ك.ك. تیایدا چالاكییەكانی نوێ كردەوە[2] .

لەم بارودۆخەدا توركیا كە لە دەستپێكی پیادەكردنی سیاسەتێكی نوێدا بوو لە بەرامبەر هەرێمی كوردستان، خودی هەرێم لە ١/مایۆ/١٩٩٤ كەوتە شەڕێكی ناوخۆوە، لەم بارەیەوە نوری تاڵەبانی، پسپۆر لە بواری یاسادا، روودانی شەڕی ناوخۆی گێڕایەوە بۆ چەند هۆكارێك، لەوانە: مێژووی ملململانێی نێوان ئەندامانی ی.ن.ك و پ.د.ك لە ساڵانی ١٩٥٨-١٩٨٨، هەروەها نەبوونی دەستوورێك بۆ هەرێمی كوردستان كە دەسەڵاتەكان دیاری بكاتو چارەسەرێك بێت بۆ كێشەكان[3] . هاوڕێ لەگەڵیدا رۆشنبیری كورد، مەریوان وریا قانع، پێكهاتەی كەسێتیو كۆمەڵگای كوردی بە كارای سەرەكی شەڕەكە دادەنێت، هەریەك لەم دوانە واهێما دەكات كە ناتوانن لەبەردەم جیاوازیو فرەبۆچوونی كۆمەڵگەدا خۆڕابگرن[4] .

هەڵسەنگاندنی ئێمە بۆ ئەو بارودۆخەی شەڕی بەرپا كرد، هەڵبژاردنەكانی ساڵی ١٩٩٢ بوو، ئەگەر چی پێكهێنانی حكومەتێكی كوردی لێكەوتەوە، بەڵام خاكی هەرێمی كوردستانی لە نێوان ی.ن.ك.و پ.د.ك. دابەشكرد، بەدیوێكی تردا بەهۆی خەباتی پێش ساڵی١٩٩٠ كە لە نێوان خۆیاندا ناوچە شاخاویو دێهاتەكانی خۆیان جیا كردبووە، بەڵام دوای ساڵی١٩٩٢ بەهۆی هەڵبژاردنو رێژەی دەنگەكان، شارە گەورەكانی هەرێمی كوردستانیان بەشكردو پارێزگای دهۆكو ناوچەی بادینان لەلایەن پ.د.ك. بەڕێوە دەچوو، هەرچی پارێزگای سلێمانیو ناوچە رزگاركراوەكانی سەر بەپارێزگای كەركووكیشە وەك قەزای چەمچەماڵو كەلار، ی.ن.ك بەڕێوەی دەبردن*، لەم نێوانەدا پارێزگای هەولێر بەهۆی نزیكی

---

1جریدة القادسیة : عدد ٤٢٩٤ ، ١٩٩٣/٩/١٩.

2رۆژنامەی كوردستانی نوێ: ژمارەی ١٢٧٥ ، ١٩٩٦/٥/٣ .

3نوری طالبانی: الصراع الحزبی فی كردستان، أسبابە وسبل حلە سلمیاً، جریدة رایة الحریة ، عدد ١١٥ ، ١٩٩٧، ل/٦-٧.

4مەریوان وریا قانع: دەستەڵاتو جیاوازی، ل/٣٩-٧٤ .

*بزووتنەوەی ئیسلامی كوردستانی عێراق بە وێنەی ی . ن . ك و پ . د . ك بە پشت بەستن بە رێژەی دەنگەكان، قەزای هەڵەبجەی خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە .

ڕێژەی دەنگەکان لە یەکدیەوە، حکومەتی هەرێمی کوردستانی تێدا دەسەڵاتدار بوو [1] لێرەوە کێشەی دارایی لە نێوان ی.ن.ك و پ.د.ك پەیدا بوو، ی.ن.ك بەرامبەرەکەی بەوە تۆمەتبار دەکرد، گومرگی ئیبراهیم خەلیل دەخاتە خەزێنەی پارتەکەی، هەروەها خودی ی.ن.ك بەوە لەلایەن پ.د.ك تۆمەتبار بوو، وەك بەرپرس لە سەرۆکایەتیکردنی حکومەت، خەزێنەی حکومەت بۆ کاروباری دارایی حزبەکەی بەکار دەهێنێت[2] .

دەکرێت دوو ساڵی یەکەمی شەڕی ناوخۆ لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٤ تا ناوەڕاستی ١٩٩٦ بە قۆناغی یەکەمی شەڕی ناوخۆ دابنرێت، چونکە تایبەتە بەوەی هەریەك لەلایەنە شەڕکەرەکان هێزی خۆیان بەکاردەهێنا، ڕۆڵی وڵاتە ناوچەییەکانیش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بریتی بوو لە پشتگیریکردنی لایەنێك بە شێوەی سیاسیی نەك سەربازی.

تورکیا ڕۆڵی لەم شەڕەدا دووبارە لە پێگەی جوگرافییەوە سەرچاوەی گرتبوو کاتێك تاڵەبانی لە دەرەوەی هەرێم پەنای بردە بەر تورکیا تا لەڕێگەی کۆپتەری سەربازییەوە لە ٣/ یۆلیۆ/١٩٩٤ بۆ ناوچەی ئارامی ژێر دەسەڵاتی پارتەکەی بگەڕێتەوە، چونکە بەهۆی شەڕەوە ئەو متمانەیەی نەبوو لە ناوچەی دەسەڵاتداری پارتیەوە بگەڕێتەوە ناو هەرێمی کوردستان[3] لەبەر ئەوەی پێشتر دوو ئەندامی سەرکردایەتیی ی ن ك بە ناوی ڕێباز و حەسەن کوێستانی لە یەکەم مانگی شەڕی ناوخۆ لەلایەن پ.د.ك غافڵکوژ کرابوون[4] .

تورکیا بە پشتبەستن بەو مافەی کە سەرپەرشتیاری هەرێمی کوردستان لەڕێگەی خاکەکەیەوە دەکرێت، خۆی کردە گەورەی دانوستانو ڕووداوەکان، شارۆچکەی سلوپی لە ١٢/یۆنیۆ/١٩٩٤ یەکەم خاڵی کۆکردنەوەی تاڵەبانیو بارزانی بوو بۆ دانوستانو ڕێکەوتن، لەم ڕوانگەیەوە حیکمەت چەتین لە میانەی ڕێکەوتنەکەدا ئەوەی خستەڕوو تورکیا لەم شەڕەدا بێلایەنە، هەمان کات ڕووداوە هەنوکەییەکانی هەرێمی کوردستان بە گرنگ ناولێناو هەروەها جەختی لەسەرئەوە کردەوە، نابێت پ.ك.ك سوود لەو بارودۆخە وەربگرێت [5] .

---

1بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە، مایکل میدو کروفت و زمیلە: أنتخابات البرلمان الکوردی فی العراق، ل/٣٢-٣٣.

2بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/١١٩٠، ١٩٩٦/١/١٥ . لیژان: پەرلەمانی شەهید، چاپخانەی برایەتی، بێ شوێنی چاپ، ١٩٩٥، ل/١١٣-١١٤ .

3 نەوشیروان مستەفا ئەمین: لەپەراوێزی دوا ڕێکەوتنامەی ستراتیجیی ی ن ك و پ دك دا، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارەی ٨٧١ ، ١٩٩٤/١٢/٢٥ .

4 -هاوڕێ باخەوان: هاوڕێنامە بۆ کوردو کوردستان، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی١٩٩٩، ل/٣٦٦-٣٣٦٧.

5ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارەی ٦٩٦ ، ١٩٩٤/٥/٣١.

به مەبەستی ڕاگرتنی شەڕی ناوخۆ، فەرەنسا وەك دەوڵەتێکی زلهێزی جیهان‌و لەژێر کاریگەری ئەو گرووپ‌و کەسایەتییە کوردییانەی ڕۆڵیان لەسەر ناوەندی دەسەڵات هەبوو، لە ۲۳/یۆلیۆ/۱۹۹٤ دا لە کۆشکی کۆماری ئەلیزا لە پاریس زنجیرەیەك دانوستانی ڕێکخست کە دەقەکەی بە ناوی ڕێکەوتننامەی پاریس ڕاگەیەنرا، بڕیار بوو تاڵەبانی‌و بارزانی بە ئامادەبوونی سەرەك کۆماری فەرەنسا فەرانسوا میتران واژۆی بکەن[1].

تورکیا بۆ هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتنەکە هەوڵێکی بێوچانی دا، دیمیرل ڕایگەیاند: "ئەگەر ئەم پڕۆژەیە بڕیاری لەسەر بدرێت کەواتە هەموو شتێ کۆتایی هات"[2]، دواتر وەزیری نوێی وەزارەتی دەرەوە مومتاز سویسال بە گەشتێك چووە پاریس‌و بە پاڵپشتی ئەمریکاو بریتانیا، فەرەنسای ڕازی کرد دەستبەرداری پرۆژەکە بێت، هاوکات ڕێی لە تاڵەبانی‌و بارزانی گرت‌و ڕازی نەبوو لە تورکیاوە بەرەو پاریس بڕۆن بۆ واژۆکردنی ڕێکەوتنەکە، مومتاز سویسال لە لێدوانێکدا وتی "با کوردی باکووری عێراق، دەسبەرداری خەونەکانیان بن‌و بە ئارامی لە شوێنی خۆیان دابنیشن، تورکیا ئامادەنییە لە پێناو بەرژەوەندی ئەمریکا، بەرژەوەندی گەلی تورکیا ژێر پێ بخات، ڕێگە بە هیچ کەس‌و ڕێکخراوێك نادرێت بچێتە ناو هەرێمی کوردستان، تا لەئامانجی سەردانەکەی ئاگادار نەبین‌و ڕەزامەندی ئێمە وەرنەگرێت[3].

ی.ن.ك. و پ.د.ك. لەسەر ئەوە کۆك بوون تورکیا لایەنی سەرەکی بوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم ڕێکەوتنە، چونکە ئەم ڕێکەوتنە چارەسەری کێشەکانی دەکرد لە هەرێمی کوردستان لە چوارچێوەی تایبەتمەندی دەسەڵاتی دەوڵەتدا، بۆیە بە پێی ڕێکەوتنەکە دەبوو بە خاوەنی سەرۆك‌و حکومەت‌و دەستوورو یاساو ژیانی دیموکراسی‌و ڕێکخستنی تایبەت لە پەیوەندییەکانی دەرەوەدا، هاوکات هەوڵێکی فەرەنسا بوو بۆ گۆڕینی هێڵی ۳٦ بۆ هێڵی ۳٤ و لابەردنی گەمارۆی کوردستان بەمەترسیەك دادەنا[4] بە نێودەوڵەتیکردنی کێشەی کورد، تورکیا ئاگاداری ڕۆڵی سەرەکی کەندال نەزان بوو لەم ڕێکەوتنەدا وەك کەسایەتیی باکووری کوردستان‌و سەرۆکی ئینستیتیوی کورد لە پاریس، بە ئاشکراش بە

---

1 الاقتتال الداخلی فی کوردستان العراق، کیف اندلع ومن المسؤل عنه، الجزء الاول، مکتب الدراسات والبحوث المرکزی، هەولێر، ۱۹۹۷، ل/٤۱۹ .

2جلال عبد الله معوض: صناعة القرار فی ترکیا، ل/٤۲ .

3 ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی : ژمار۲۷، ۱۲۷، ۱\۱\۱۹۹٦.

4 نەوشیروان مستەفا ئەمین:لە پاریسەوە بۆ دبلن بۆ دواوە چونێکی خەمناك: ڕۆژنامەی کوردستانی نوی،ژمارە/.۱۱۷، ۲۰\۱۲\۱۹۹٥. هوشیار زیباری:من الذی افشل اتفاقیة باریس، وەرگیراوە لە: الاقتتال الداخلی فی کوردستان العراق، ل/٤۱٥-٤۱٦.

چالاکی دژە بەرژەوەندیەکانی تورکیای ناوبرد، دواجار هەوڵی فەرەنسا بۆ گۆڕینی هێڵی ٣٦ بۆ هێڵی ٣٤ و لابەردنی گەمارۆی کوردستان بەمەترسیەك دادەنا[1]

چونکە لەلایەك هێڵی ٣٤ هەردوو پارێزگای دەوڵەمەند بە نەوت مووسڵو کەرکووك ی دەگرتەوە، لەلایەکی تریشەوە لابردنی گەمارۆی ئابووری هەرێمی کوردستان، دەبووە هۆی بەهێزکردنی ژێرخانی ئابووری هەرێمو پایەیەکی سەرەکی لە بنەمای دەوڵەتی کوردی دەچەسپاند.

رێکەوتننامەی پاریس، تورکیای هاندا تاوەکو چاو بە سیاسەتی خۆیدا بخشێنێتەوە، لەبەر ئەوە سیاسەتی متمانە، بۆ سیاسەتی گومان گۆڕا کە بەم شێوەیە بەرجەستەی کرد:

**•ئامادەبوونی تەواو لە سەرجەم رێکەوتنەکانی نێوان ی ن ك و پ د ك دا.**

لە ساڵانی ١٩٩٤، ١٩٩٥، ١٩٩٦ چەندین دانوستانو رێکەوتنی دەرەکی لە نێوان لایەنە سەرەکیەکاندا لەوانە، درۆهیدا، دبلن، تاران و پرۆژەی ئاشتی (مستەر دویچ) ساز کرا.

تورکیا تەنها لە رێکەوتننامەی تاران دا ئامادەیی نەبوو، لەوانی دیکەدا هەندێك واتاو تێگەیشتنی تایبەتی خۆی لە ناواخنی ئەو پرۆژەی رێکەوتنانەنەی سەرەوە چەسپاند، گرنگترینیان چەمکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو، کە گۆڕی بە بنکەی کارگێڕی پارێزگاکانی باکووری عیراق، لە سەرجەمیاندا خاڵێك جێگیر کرا بریتی بوو لە "هەموو خاڵی رێکەوتنەکە پێویستە بەرژەوەندییە ئاسایشییە مەشروعەکانی تورکیا لە بەرچاو بگیرێت". لێرەدا مەبەستی سەرەکی پ.ك.ك بوو، کە گرووپێکی تیرۆرستییەو هۆکاری سەرەکی نائارامی ناوچەکەیەو هەڕەشەیە بۆ سەر ئاسایشی تورکیا، ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکە لە پێناو لەناوبردنی، هاریکاری تەواو بکەن. ئەمەش ئەو خاڵەبوو ی.ن.ك بەهیچ جۆرێك پەسەندی نەدەکردو پ.د.ك داکۆکی لێ دەکرد[2] .

لەم سۆنگەیەوە تێڕوانینی هەردوولا بۆ ئاسایشی نەتەوەیی هەرێمی کوردستان دەردەکەوێت، تاڵەبانی دەڵێت: "ئاسایشی نەتەوەیی پاراستنی سنوورەکانە نەك ئیدانەکردنی پ.ك.ك، گرنگ ئەوەیە سنوورەکان بپارێزین لە بەرامبەر تورکیاداو ئەوەی دەمێنێتەوە

---

1 نەوشیروان مستەفا ئەمین:لە پاریسەوە بۆ دبلن بۆ دواوە چونێکی خەمناك: رۆژنامەی کوردستانی نوی،ژمارە/.١١٧، ١٩٩٥\١٢\٢٠. هوشیار زیباری:من الذی افشل اتفاقیة باریس، وەرگیراوە لە: الاقتتال الداخلی فی کوردستان العراق، ل/٤١٥-٤١٦.

2فەردیدون عەبدولقادر: کێ پرۆسەی ئاشتی زیندە بەچاڵکرد، رۆژنامەی کوردستانی نویٚ ژمارە/١١٩٢ ، ١٩٩٦\١\١٧.

خۆمان دەتوانین بە شێوەی سیاسیی نەك چەكداری لەگەڵ پ.ك.ك چارەسەری بكەین[1]، بەڵام بارزانی دەیووت: "تاكە خاڵێك وا دەكات هاریكاری لە نێوان ئێمەو توركیادا بێتە كایەوە، بوونی چەكدارانی عەبدوللا ئۆجەلانە لە كوردستانی عێراقداو، لەوە زیاتر هیچ خاڵێكی دیكە لە ئارادانییە لەگەڵ توركەكان كۆمان بكاتەوە"[2]، لەم وتارانە ئەوە گەلاڵە دەبێت كە گەڕانەوەی سیاسیی (المرجعیه السیاسیه) لە هەرێمی كوردستان لە ناواخنی بیرۆكەی سەركردەكانەوە هەڵقوڵا بوو نەك پەرلەمان یان یاساو دەستورێك كە كۆ دەنگیەكی گشتی سیاسی لەسەر بێت، هەریەك لەو دوو كەسایەتیە بەپێی تێڕوانینی خۆیو پارتەكەی ئاسایشی نەتەوەیی دیاری دەكرد، لەم نێوانەدا توركیا تەواوی هەوڵی خۆی خستبووە كار تا لەرێگەی رێكەوتنو ململانێی سیاسیی ئەو دوو لایەنەوە، رەوایەتیی خۆی لە كوردستان بسەلمێنێت.

- **بەشداریكردنی ناڕاستەوخۆ لە شەڕی ناوخۆدا:**

هەرچەندە توركیا رایگەیاندبوو لە رووداوەكانی هەرێمی كوردستاندا بێلایەن دەبێت، بەڵام لە رێكەوتننامەی پاریسەوە ئەوەی لا گەلاڵە بوو، كە پارتەكانی هەرێمی كوردستان لە باری ئاشتیو یەككەوتندا پرۆژەی دەسەڵاتی كوردی بەرەوپێش دەبەن، بۆ ئەم مەبەستە لەڕوانگەی ئەو پەندەی تورك دەڵێت "كورد لەبەرامبەر كورد دەبێتە گورگ- Kudos Kurdini Lupus"، پشتگیری لایەنێكی دژی لایەنەكەی تر كرد، لەم بارەدا پ.د.ك هەڵبژاردەی توركیا بوو، چونكە هاوسنووری سیاسییو هاوهەڵوێستی لەبەرامبەر پ.ك.ك، كە بە ئاشكراو روونی پ.ك.ك بە پارتێكی تیرۆرست ناو دەبردو بە گەورەترین هەڕەشەی دادەنا بۆ سەر هەرێمی كوردستان[3]، بەڵام ی.ن.ك و تاڵەبانی لە ناو بازنەی سیاسەتی توركیادا نەبوون، چونكە: توركیا سنووری جوگرافی لەگەڵ دەسەڵاتی ی.ن.ك دا نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا توركیا نیشانەیەكی پرسیاری لەبەرامبەر دانا بوو، لەبەر چەند هەڵوێستێك كە لەڕووداوە سیاسییەكاندا نواندبووی، لەوانە:

- تاڵەبانی بۆ یەكەم جار توركیای كۆماری لە ساڵی ١٩٩٣ خستە سەربار كە وتوێژێكی سیاسی لەگەڵ پ.ك.ك وەك رێكخراوێكی كوردستانی دەست پێبكات، باسی پێكەوە ژیانێكی ئارەزوومەندانەی سیاسی لە نێوان كوردو تورك هێنایە گۆڕێ، بەڵام كاتێك پرۆژەكە سەری نەگرت، توركیا ویستی بۆ راوەدونانی پ.ك.ك،

---

1رۆژنامەی كوردستانی نوێ ژمارە/١٢٧٤، ٢٨/٤/١٩٩٤ .

2دیمانەی سەرۆك بارزانی لەگەڵ العرب الیوم دا،مەكتەبی ناوەندی رێكخستن، زنجیرەی ٨ ساڵی ١٩٩٨، ل/١٤.

3رۆژنامەی كوردستانی نوێ : ژمارە/٦٠٠، ٣٠/١٠/١٩٩٤.

بە پشتبەستن بەو پەیوەندییەی لەگەڵ سەرکردایەتیی کورد هەیەتی، سوپا بهێنێتە هەرێمی کوردستان، تاڵەبانی لەو کاتەدا رایگەیاند، بەهیچ جۆرێك ئامادەنییە هاریکاریی سوپای تورکیا بکات[١] .

- تاڵەبانی لە لێدوانەکانی جەختی لەسەرئەوە کردەوە، پ.ك.ك تیرۆرست نییە، بەڵکو کاری تیرۆری ئەنجام دەدەن[٢]، کەواتە بە بڕوای ی.ن.ك. بنەبڕکردنی پ.ك.ك. لە کوردستاندا بە پێویست نەدەزانرا، لێرەوە جیاوازیی لەگەڵ تورکیا پەیدا بوو.
- راگەیاندنو حکومەتی تورکیا بەرامبەر ی.ن.ك زۆرباش نەبوون، چونکە لە کاتێکدا لە ساڵی ١٩٩٢ سەرۆکایەتیی حکومەتی هەرێمی دەکرد لە جەنگ دژی پ.ك.ك، گەریلاکانی نەخستنە بەردەستی تورکیا کە ژمارەیان لەنێوان ١٥٠٠-٢٠٠٠ بوو، بەڵکو وەك پەنابەری سیاسی مامەڵەی لەگەڵ کردن. نوێنەرێکی ئەنجومەنی نیشتمانیی تورکیا ئەمەی بەخراپترین کاری قێزەون پێناسە کرد[٣]، تورکیا ئەوەی خستەڕوو کە ی.ن.ك یارمەتیو پەنادەریان بووە[٤].

- **هەڵقوڵستنەوە لە شەڕی ناوخۆ بۆ هێرش کرنە سەر پ.ك.ك :**

پ.ك.ك. تا سەرەتای ساڵی ١٩٩٤ چالاکیی بەڕووی تورکیا لەلایەن دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە سنووردار کرابوو، دوابەدوای ئەم مێژووە تورکیا رێکەوتنە سەربازیەکەی هەڵوەشاندەوە، چونکە گومانی لە شەڕی ساڵی ١٩٩٢ی حکومەتی هەرێمو پ.ك.ك هەبوو، ئەمەی بە چاوبەستێکی سیاسەتی کوردی دانا، کە هەرێم لە بری راگەیاندنی فیدراڵی، لە تورکیای کرد. بەواتایەکی دیکە رۆژی ٤/ئۆکتۆبەر/١٩٩٢ رۆژی راگەیاندنی فیدراڵییەتی هەرێمی کوردستان بوو، دروست لە ٥/ئۆکتۆبەر شەڕی نێوان پێشمەرگەو گەریلا دەستی پێکرد، لێرەوە وەك رۆژنامەنووسێکی تورکی دەڵێت "ئایا بەڕاستی پێشمەرگە شەڕی پ.ك.ك یان کرد، یان تەنها فێڵێکی کورد بوو بۆ هێورکردنەوەی دژە کرداری تورکیا بەرامبەر راگەیاندنی فیدراڵی"[٥] .

---

1المسالة الكردية، تركيا تنتقد طالباني، مجلة شؤون تركية ، اعداد: محمد نورالدين، عدد ٩ ، ١٩٩٣، ل/٥٥.

2رۆژنامەی کوردستانی نوێ ، ژمارە/١٣٠٦ ، ١٢\\ ٦\ ١٩٩٦ .

3جون شكون فيرجا: لماذا دخلنا الى العراق؟ لماذا نخرج، مجلة شؤون تركية ، اعداد: محمد نورالدين، عدد ٤ ، ١٩٩٢، ل/١٤.

4رۆژنامەی کوردستانی نوێ ، ژمارە/١٣٠٧ ، ١٢ /٦/١٩٩١.

5علي سيرمان: معادلة غامضة جدا، مجلة شؤون تركية ، اعداد:محمد نورالدين، عدد ٢ ، ١٩٩٢ ، ل/٩.

ئۆج ئالان سەرەتای ساڵی١٩٩٤ لە ئەنجامی پرۆژەی ڕێکەوتنەکانی درۆهیدا و دبلن دەستیکردە دژایەتیی هەرێم، ڕایگەیاند پ.د.ك و بارزانی، بوونەتە گەمەی دەستی تورکیاو ئەمریکا[1]، ئەمە وەك هەڵوێستێکی پ.ك.ك بوو لە دژی ئەو خاڵەی، کە دەبوو مەشروعییەتی ئاسایشی تورکیا لەو پرۆژانەدا لەبەرچاو بگیرێت، لە بەرامبەردا پ.د.ك داکۆکی جێبەجێکردنی دەکرد، بۆ ئەم مەبەستە جارێکی دیکە ئۆج ئالان ئەوەی خستەڕوو، هەموو هەوڵێك دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی ڕێکەوتنەکان هەڵوەشێنێتەوە، بە ئاشکرا ئەوەی ڕاگەیاند کە پێویستە (ی.ن.ك و پ.د.ك) ڕێکەوتنەکە بدڕێنن[2] .

بۆ ی.ن.ك، ئەم هەڵوێستەی پ.ك.ك لە دژی تورکیاو پ.د.ك لە کاتی شەڕی ناوخۆدا، بووە پشتگیریو خاڵی بەرچاوی نزیکبوونەوەی ڕاوبۆچوونەکانی نێوان ی.ن.ك و پ.ك.ك، چونکە ی.ن.ك لەو باوەڕەدا بوو بەهیچ جۆرێك دانپیانانی بۆ ئاسایشی تورکیا نییە، بەو شێوەیەی تورکیا دەخوازێت، لە بەرامبەردا پ.د.ك هەردوو لایەنی ڕکابەری بە هاریکاریکردن لە دژی خۆی وەسف کرد[3] .

پ.ك.ك لە ٢٦/یەنایر/١٩٩٤ نزیك شاری جەزیرەی سەر بە پارێزگای دیاربەکر، بە دوری ٤٢ کم لە خاکی هەرێمەوە، هێرشیان کردە سەر بۆرییە نەوتییەکانی کەرکوك - یومورتالیك[4]، ئەمە بۆ تورکیا هێڵی سور بوو نەدەبوو پ.ك.ك بیبەزێنێت. لەلایەکی تر بەرپابوونی شەڕی ناوخۆ سوودی زۆری بۆ پ.ك.ك هەبوو، چونکە هێزەکانی پ.د.ك بە شێوەیەکی سەرەکی بەرەوڕووی هێزەکانی ی.ن.ك بوونەوەو دەستبەرداری سنوورەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا بوو بوون، کە لە ئەنجامدا ناوچەیەکی بەرفراوان بۆ پ.ك.ك پەیدا بوو، نەك تەنها چالاکی بەڵکو دەسەڵات بە ناوی "دەسەڵاتی گەل" و "ئەیالەتی بۆتان- بادینان" پەیڕەو بکەن. ئۆج ئالان ئاماژەی بەوەدا هەوڵەکانمان بۆ شکستهێنانی ڕێکەوتنو دانوستانەکانی نێوان ی.ن.ك و پ.د.ك و ڕاکێشانی سوپای تورکیایە بۆ ناو هەرێمی کوردستان دەخەینە گەڕ[5]. لە ٢٥/ئۆگستۆس/١٩٩٥، پ.ك.ك هێرشیان کردە سەر بارەگاکانی پ.د.ك، ڕۆژنامەکەیان بەناوی وڵات ڕایگەیاند: "ئامانجمان بنەبڕکردنی خیانەتە،

---

1 روبرت اولسن: المسألة الكردية، ل/٦٩.

2 ليزان: ث . ك .ك جسم غريب فى الحركة الكردية، مطبعة برايەتى، بدون مكان الطبع، ١٩٩٥، ل/٣٢-٣٥.

3حزب العمال الكردستانى p.k.k ودوره فى حركة التحرر القومى الكوردستانى، مكتب الدراسات والبحوث المركزى، هەولێر، ١٩٩٦، ل/٥٤-٥٦ .

4ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ، ژمارە/٥٩٨١ ، ٢٧/١/١٩٩٤.

5لێزان: ب .ك .ك جسم غريب فى الحركە الكرديە، ل/٣٢.

تا ئەوکاتەی یەکێتیی دیموکراتی لە باشووری کوردستان دیتەدی، بەردەوام دەبین"[1] . هەمان ڕۆژنامە لە ٣/ئۆگستۆس/١٩٩٥ هەواڵی دەست بەسەراگرتنی دهۆك‌و ئاکرێ‌و سەرسەنگ‌و زاخۆو ئیبراهیم خەلیلی بلاوکردەوە[2] .

ئەم ڕووداوە کاتێك بوو پ.د.ك لەگەڵ ی.ن.ك لە سەروبەندی ئاگربەستدا بوو، کە یەکلاییبوونەوەی (پ.د.ك)ی ڕەخساند بۆ بەرەنگاری‌و پاشان شکاندنی هێرشی پ.ك.ك . لە ٢٣/ئۆکتۆبەر/١٩٩٥، بارزانی بروسکەی سەرکەوتنی ڕاگەیاند، ئۆج ئالان لە ١١/ نۆڤەمبەر/١٩٩٥، بانگەشەی ئاگربڕی بێ مەرجی کرد، ڕۆژی دوات پ.د.ك. پەسەندی کرد[3].

بارودۆخی چالاکبوونی پ.ك.ك تورکیای هەراسان کردبوو، لە ٢٩ی یەنایری١٩٩٤ بە فڕۆکە بۆردومانی ئۆردوگای زەڵێ ی کرد[4]، هەروەها لە دەسپێکی شەڕی ناوخۆ لە ١٧/مایۆ/١٩٩٤دا جارێکی تر بۆردومانی هەمان شوێنی کردو ٥٨ کەسی لێکوشتن[5] دواتر لە مانگەکانی نۆڤەمبەرو دیسەمبەری ١٩٩٤دا، هێرشێکی بەربلاوی بۆ سەر گوندەکانی باکووری کوردستان دەست پێکرد، سەرئەنجامی توندوتیژی سوپا دوو هەزار خێزان‌و خەڵکی سڤیل بەرەو سنووری هەرێمی کوردستان هەڵهاتن[6] . سەرباری ئەوە ژمارەیەکی زۆر گەریلای ناوچە سنووریەکانی تورکیا، هاتنە ناو هەرێمی کوردستان، ئەمە هۆکاری سەرەکی ئەنجامدانی گەورەترین لەشکرکێشیی تورکیا بوو، بە ژمارەی ٣٥ هەزار سەربازی پڕ چەك بە هەموو پێداویستییەکی ئاسمانی‌و زەمینی، لە قوولایی ٤٠کم و بە درێژی ٢٤٠کم سنووریان بەزاند، لە ماوەی مانەوەیان ٢١/مارت-٤/مایو/١٩٩٥دا تەواوی تواناکانیان بۆ پێکانی بنکەکانی پ.ك.ك، لە ناو خاکی هەرێمی کوردستان بەکارهێنا[7] .

چیلەر بە شێوەیەك ناوی ئەم ئۆپەراسیۆنەی برد" بەدواداچوونێکی خێرایە لە دژی دوژمنکاریی هەڵهاتووەکان"، ئەفسەرێکی سوپا ڕونیکردەوە"

ئامانجمان گەورەترین وێرانکارییە لە ناوچەکەدا"، لێکۆڵەرەوەیەکی سیاسیی وا هێمای کرد

---

1ڕۆژنامەی وڵات ژمارە/٨٦، ٢٧/٨/١٩٩٥.

2ڕۆژنامەی وڵات ژمارە/٨٧ ، ٣١/٨/١٩٩٥.

3حزب العمال الكردستاني p.k.k و دوره في حركة التحرر القومي الكوردستاني، ل/٥٨ . لێزان: ب .ك .ك جسم غريب في الحركة الكردية، ل/٧٤-٧٦.

4ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ، ژمارە/٦٠٠ ، ٣٠/ ١/ ١٩٩٤.

5 هاورێ باخەوان: هاوڕێنامە، ل/٣٦٧.

6Nivisingcha Peywendiyan u Ragehandine li Parezgcha Duhuk: Kampa Etrus، Rastiyaen Pirse U Kiryaren P .K .K E ، Kolica Seria، Duhuk ،1999،29.

7جلال عبد لله معوض: صناعة القرار تركيا، ل/٤٥-٤٦ .

*دورگەی قوبرس لە ساڵی ١٩٧٤دا بەشی باکووری لەلایەن سوپای تورکیاوە لەهێرشێکی کتوپڕدا دەستی بەسەرداگیرا، ئەوەی هەلە کە لەسەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیەکاندا بەشێك بووە لەدەوڵەتی عوسمانی.

"هەستکردن بە بەرز ڕاگرتنی گیانی نیشتمان پەروەری، زۆر گەورەترە لەو کاتانەی هێرشمان کردە سەر قوبرس لە ساڵی١٩٧٤"[١] .

بەهۆی شەڕی ناوخۆوە تورکیاو پ.ك.ك توانییان ململانیی سەربازیی نێوانیان بۆ ناو هەرێمی کوردستان بگوازنەوە، ئەوەی بە شێوەیەکی سەرەکی لەم نێوانە زیانی بەرکەوت دانیشتوانی سەر سنوورەکان بوون، چونکە سوپای تورکیا لە کاتی بەدوادا چوونی پ.ك.ك، چەندین کەسی ناوچە داگیرکراوەکانی دەسگیرکردو وەك ئەندامی پ.ك.ك مامەڵەی لەگەڵ کردن. هەروەها زیاتر لە ١٥ هەزار سڤیل، لە ئەنجامی بەکارهێنانی سیاسەتی زەویی سوتاو و بۆردومانی هەڕەمەکی، چاندنی ژمارەیەکی زۆری مین، ئاوارەی شارو شارۆچکەکان[٢] تورکیا ڕاگەیاند[٣] ، ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لە کوردستان Kurdistan watch لە ڕاپۆرتێکدا، سەبارەت بە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ، ئەوەی خستە برچاو، ٧١ گوند لە بادینان خاپوور بوون، ٢٠ کەس لەسڤیلی ناوچەکە کوژراون، ئەمە جگە لە تۆمارکردنێکی ٢٠ خاڵی، کە سووتانو کوشتنو گرتنو ئاوارەبوونیان لەخۆ گرتبوو[٤] .

لە سەروبەندی دوا ڕۆژەکانی لەشکرکێشییەکە دیمیریل بابەتێکی گرنگی مێژووی ورووژاندو بە ئاشکراو بە جیاواز لەهەموو سەرۆکەکانی پێشوو ڕایگەیاند "ئەم هێڵە لێرەدا هەڵەیە، پێویستە سنوور بە لای شاخەکانی عێراقدا گوزەر بکات بۆ ئەوەی لەبەردەم تێپەڕبوونی تیرۆریستەکان ڕێگر بێت، یا لێگەڕێین سنوورەکان ڕاست بکەینەوە، بە شێوەیەك لەسەر چیاکانەوە بۆ دەشتەکان بێنە خوارەوە"[٥] هەروەها بەڕاشکاوی دانینا بەوەدا " تا ئێستا ویلایەتی موسل سەر بە تورکیایە" [٦] .

ئەم وتارە لەگەڵ لەشکرکێشییە بەرفراوانەکەو مامەڵەی توندوتیژی سوپا لە میانەی هێرشەکەدا، نارەزاییەکی هەرێمیو نێودەوڵەتییو ڕێکخراوە مرۆییەکانی لێکەوتەوە، کە لە سەرەکیترین هۆکاری پاشەکشەی سەربازی سوپاکە بوو، بەڵام خراپترین ئەنجام کە لێی کەوتەوە، دەستبەربوونی وڵاتانی ناوچەیی بوو بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشیی لە هەرێمی کوردستان.

1جيف سيموند: عراق المستقبل، ل/١٨٧—١٨٨.

2 جلال عبدلله معوض: صناعة القرار تركيا، ل/٤٦"

3جيف سيموند: عراق المستقبل، ل/١٨٨ .

4منظمة حقوق الانسان فى كردستان: ١/حزيران/ ١٩٩٥، أربيل، ل/١٤-١٥.

5 جيف سيموند: عراق المستقبل، ل/١٨٨-١٨٩.

6 محمد نورالدين: تركيا فى الزمن المتحول، ل/٢٤٨.

## تەوەرەی چوارەم
## پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا
## لە قۆناغی دووەمی شەڕی ناوخۆدا
## ١٩٩٦-١٩٩٨

ساڵی ١٩٩٦ بۆ تورکیاو هەرێمی کوردستان ساڵی هەڵاوسانی کێشەو گرفتەکان بوو، تورکیا کەوتە بەردەم دوو کێشەوە، بە شێوەیەك لە دوای دروستبوونی تورکیا هیچ کاتو لە یەك کاتدا یەکانگیر نەبوون، ئەویش کێشەی کوردو ئیسلامی بوو کە بە کێشەی یەکپارچەیی خاكو سیستەمی عەلمانیەت لە تورکیا ناسرا بوو، لەم ساڵەدا بوونە گرێیەکی ئاڵۆزو رەنگدانەوەی هەبوو لە سیاسەتی دەرەوەی تورکیا. کێشەی کورد بەتایبەت لە ساڵی١٩٩٠ بەدواوە چ لە ناوخۆی تورکیاو چ لە هەرێمی کوردستاندا، رۆژ بەڕۆژ لە برەودا بوو، لەلایەکی تریشەوە هەڵبژاردنی پەرلەمانی تورکیا پێشکەوتنی ئیسلامییەکانی پێوەدیار بوو کە لە دیسەمبەری١٩٩٥، زۆرینەی کورسیی پەرلەمان لەلایەن پارتی رەفاه بەدەست هاتبوو، کە رێژەی لە ٢٦٪ ی کورسییەکانی مسۆگەر کردو بوو بە مەترسییەکی گەورە لەسەر سیستەمی عەلمانیەت. هەرچەندە دوای حەوت مانگ لە هەڵبژاردن واتە لە ٢٩/یونیۆ/١٩٩٦دا حکومەتی ئیئتیلافی لە نێوان پارتی رەفاه و پارتی رێگای راست وەك رێکەوتنێك لە نێوان رەوتی ئیسلامی و عەلمانی پێکهاتو ئەربەکان بوو بە سەرۆکی حکومەتو چیلەر پۆستی جێگری سەرۆکی حکومەتو وەزیری دەرەوەی وەرگرت [1]، بەڵام ئەربەکان نەیتوانی لە سەرۆکایەتی حکومەت سەرکەوتن بەدەست بهێنێتو دوای یەك ساڵ، لە ١٨/یونیۆ/١٩٩٧، دەستی لە کار کێشایەوەو لە ١٢/ یۆلیۆدا مەسعود یەلماز و ئەجەڤیت حکومەتی ئیئتیلافیان پێکهێناو تا ماوەی دیاریکراوی خۆی، لە دەسەڵاتدا بوون [2].

لەگەڵ کێشە ناوخۆییەکانو حکومەتە تەمەن کورتەکانی تورکیا، هاوکات هەرێمی کوردستان لەبەردەم چەند گرفتێکی گەورەدا بوو، گرنگترینیان چارەنووسی هەرێمەکە بوو لەبەردەم سەربەخۆیی یان لکان بە عێراقەوە، هەروەها رووخان یان مانەوەی رژێمی عێراقی، کە بەهیچ جۆرێك ئاسۆیەکی روونی لە بەرچاو نەبوو، سەرەڕای ئەمانە، شەڕی ناوخۆ لە دوای

---

1رەزا هیلال: تورکیاو ململانێی عەلمانیەت-ئیسلام-کورد، و: دلێر عباس، نوفسێتی ژین، سلێمانی، ١٩٩٩، ل/٢٣-٢٤.

2محمد نورالدین: ترکیا ألجمهوریة الحائرة، ل/١٠٨.

سەرنەگرتنی چەندین ڕێکەوتنی ناوخۆییو دەرەکی، دانشتوانی لە سەقامگیریو ئارامی سیاسیی بێ ئومێد کردبوو.

ی.ن.ك لە سەرەتای یەنایری١٩٩٥ دەستیگرت بەسەر تەواوی شاری سلێمانیو ناوچە ڕزگارکراوەکانی کەرکوكو سەنتەری شاری هەولێرو قەزای کۆیە، کە ئەمەش زۆرینەی هەرێمی کوردستان بوو لە ڕووی دانیشتوانو زەمینەوە، بەڵام لە ڕووی جوگرافیای سیاسییەوە پێگەی دەسەڵاتی لاواز بوو، چونکە هیچ دەروازەیەکی فەرمی نەبوو بەڕووی دەوڵەتە دراوسێکاندا، سنوورەکەی لە باکوورو ڕۆژئاوای باکوور لەدەست پ.د.ك دا بوو، لە ڕۆژئاواو باشوور ڕژێمی عێراقی بوو کە پەیوەندیی لەگەڵ هەریەك لەو دووانە نارێك بوو، تەنها دروازەیەك کە بۆی مابووەوە، سنووری ڕۆژهەڵات بوو بەڕووی دەوڵەتی ئێراندا، ئەمەش بەهۆی داخراوی دوو سنوورەکەی تر بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو، لێرەوە ی.ن.ك خۆی لەبەردەم کەنارگیریەکی سیاسیی، ئابووری ی توندو شەڕێکی درێژخایەندا بینیەوە، کە بوو بەهۆی ئەوەی لەلایەك بکەوێتە ژێر فشاری دەوڵەتی ئێرانو لەلایەکی دیکەشەوە بۆ شکاندنی گەمارۆی ئابووری بڕیاری چارەنوسساز بدات.

ئێران لە ٢٧/یۆلیۆ/١٩٩٦دا لەلایەن ی.ن.ك ەوە ڕێگەی پێدرا بۆ هێرشکردنە سەر پارتی دیمکراتی کوردستانی ئێران لە شارۆچکەی کۆیە [1] کشانی سوپای ئێرانی بۆ ناو کوردستان لە کاتێکدا بوو شەڕی ناخۆ سەرلەنوێ دەستی پێ کردبوو، لەم ڕوانگەیەوە لەلایەن پ.د.ك بە پشتگیریکردنی ی.ن.ك و سەروەری شکاندنی هەرێمەکەی لە قەڵەم درا [2].

پ.د.ك لە قۆناغی یەکەمی شەڕی ناخۆدا دەسەڵاتی بەسەر کەمینەی خەڵكو خاکی کوردستاندا هەبوو، بنکەی دەسەڵاتەکەشی بایەخێکی زۆری هەبوو لە ڕووی جوگرافیای سیاسییەوە، چونکە جگە لەوەی لە ڕۆژهەڵاتو باشوورەوە سنووری هاوبەشی لەگەڵ ی.ن.ك و ڕژێمی عێراقی هەبوو، لەلایەکی ترەوە لە باکوورو ڕۆژئاوا سنووری لەگەڵ تورکیا هەبوو، کە ڕێگایەکی فەرمی نێودەوڵەتیی هەرێمی کوردستانی لەسەر بوو کە بە خاڵی گومرگی ئیبراهیم خەلیل دا گوزەری دەکرد، دواجار بۆڕییە نەوتییەکانی نێوان تورکیاو عیراق سنووری دەسەڵاتی پ.د.ك دا تێدەپەڕی، هەموو ئەمانە وایان کرد ئەم ناوچەیە بایەخێکی سیاسییو ئابووری زۆری هەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پ.د.ك لەژێر چەندین فشاری ناوخۆییو دەرەکیدا بوو لەوانە:

---

1 ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ: ژمارە/١٣٤٧ ، ١٩٩٦/٧/٣١.

2الاقتتال الداخلی فی کوردستان العراق، ل/١٧٧-١٧٨.

أ.   سەرکەوتنی هێزەکانی ی.ن.ك لە بەرەکانی جەنگدا[1]، بەتایبەت لە ١٧/ ئۆگستۆس/١٩٩٦، کە پ. د.ك مەترسی نەمانی تەواوەتی کەوتە سەر.

ب-   ی.ن.ك بەو پێیەی پایتەختو پەرلەمانو حکومەتی هەرێمی بەدەستەوە بوو لە سەروبەندی جێبەجێکردنی بڕیاری ٩٨٦ رایگەیاند، سەرپەرشتی ١٠٠ کم لە بۆرییە نەوتییەکان لە خاکی کوردستان دەکات [2]، پ.د.ك ئەوەی لاڕوون بوو کە ئەگەر ئەم بڕیارە جێبەجێ بکرێت، ئەوا ئەرکی پاراستنی بۆرییە نەوتییەکانو داهاتی نەوتەکە بە رژێمی بەغداد یان ی.ن.ك دەسپێردرێت، لە هەردوو بارەکەدا ناوچەی ژێردەسەلاتی لە رووی سیاسییو ئابووری یەوە قەتیس دەبێتو دەکەوێتە بەر مەترسی لە دەستدانی دەسەلات لە هەرێمی کوردستاندا[3] .

ج-حکومەتی نوێی تورکیا بە سەرۆکایەتی ئەربەکان، سیاسەتی دەرەوەی بریتی بوو لە کرانەوەی بەڕووی دەوڵەتانی جیهانی ئیسلامیو عێراق بەتایبەتی، بۆ ئەم مەبەستەش بۆ یەکەمین جار لە دوای یەکەم جەنگی کەنداو، دوو وەزیری حکومەتەکەی بۆ تاوتوێکردنی هەناردەی نەوتی عێراقی بەرەو تورکیا، رەوانەی بەغداد کرد[4] ئەمە وەك هەنگاوێك بۆ هەلگرتنی گەمارۆی ئابووری عێراقو قەرەبوکردنەوەی زیانە ئابوریەکانی تورکیا لەم رێگەیەوە. هاوکات سەرۆکایەتیی حکومەت هاوڕای ئەو پرۆژەیەی ئەجەڤیت بوو لە ئەپریلی١٩٩٦ پێشکەشی پەرلەمانی کردبوو، شەش خالی لەخۆ گرتبوو، لە گرنگترینیان: پێویستە کورد لە هەرێمی کوردستان لەگەڵ رژێمی بەغداد ریکەوتن ساز بکەن، کارو ئەرکی هێزی هاوپەیمانان لە بنکەی ئەنجەرلیك دووبارە رێکبخرێتەوە، هێزی تورکیا بەقوولایی ٢-١٥کم لە خاکی کوردستاندا پشتێنەی ئاسایشی پێکبهێنێت[5]، بەشداربوونی عێراق بۆ یەکەمجار پرۆژەیەکی نوێی تورکیا بوو بۆ قۆرخکردنی هەرێمی کوردستان لە چوارچێوەیەکی ناوچەییداو، خودی ئەربەکان لەو باوەڕەدابوو کێشەی کورد بە چوار دەوڵەتە ناوچەییەکەوە بەندەو پێویستە چارەسەرکردنیشی لە چوارچیوەی دەوڵەتە ناوچەییەکان دەرنەچێت[6] .

---

1رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە/١٣٦٥، ١٩٩٨/٨/٢١.

2جلال عبدالله معوض: صناعة القرار فی ترکیا، ل/١٦٠.

3روبرت اولسن، المسألة الکردیة، ل/٧٩.

4رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە/١٣٥٦، ١٩٩٦/٨/١١.

5رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە/١٢٦٣، ١٩٩٦/٤/١٥.

6روبرت اولسن: المسألة الکردیة، ل/٧٥.

پ.د.ك له بەرامبەر هەڕەشەكانی ئەمانو فشاری توركیادا له ٢٥/یۆلیۆ/١٩٩٦دا لەگەڵ بەغداد، لەسەر چەند خاڵێك ڕێكەوتن گرنگترینیان بریتی بوو له: ئاڵوگۆڕكردنی زانیاری سەربازی، هەماهەنگی بیرو بۆچوونی سیاسیی، خۆ ئامادەكردنی پ.د.ك له ڕووی سەربازییەوە[1]، لێرە بەدواوە قۆناغی نوێی شەڕی ناوخۆ ئەو خەسڵەتە پەیدا دەكات كە هێزە شەڕكەرەكان بۆ بەردەوام بوون له جەنگدا پشت بە هێزی دەرەكی دەبەستنو هەریەك لەو هێزانە ململانێی خۆیان بۆ ناو هەرێمی كوردستان دەگوازنەوە، لەم ئاڵوگۆڕو ڕێكەوتنە سیاسییانەوە، ئۆپەراسیۆنی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی له هەرێمی كوردستان وەك ناوچەی خۆشگوزەرانی لێ هات بۆ دەوڵەتە دراوسێكانو باجەكەشی لەڕوی گیانیو ماڵیەوە دانیشتوانی هەرێمی كوردستان بەبێ جیاوازی دەیانبەخشی، بارزانی لەم پێودانگەدا ئەوەی لاگەڵاڵە بوو كە "ئەگەر كێشەی كورد ئەوەی بەسەردا سەپێنرا لەگەڵ هێزە هەرێمیەكان مامەڵە بكات، ئەوا لەم بارەدا مامەڵەكردن لەگەڵ عێراقدا باشترە"[2].

ئەم ڕێكەوتنە سەرەتایەك بو بۆ هاوپەیمانی نێوان عێراقو پ.د.ك، كە بەدوایدا بارزانی له نامەیەكدا بۆ سەرۆك كۆماری عێراق سەدام حسین، داوای یارمەتیكردو بانگێشتی سوپای عێراقی كرد، له وەڵامدا ٣٠-٤٠ هەزار سەربازی عێراقیو ٣٥٠ تانكو ٣٠٠ تۆپ له ٣١/ئۆگستۆس/١٩٩٦ له باشوورەوە هێرشیان كردە ناو پارێزگای هەولێر، له ئەنجامدا پایتەختی هەرێمی كوردستان داگیر كرا[3]، ئەم كردارە هەڵەیەكی گەورەی مێژوویی پ.د.ك بوو، كە هەرێمی كوردستانی خستە بەردەم گەورەترین ئەگەری لەناوچوون، چونكە هاتنی سوپای ئێران یان توركیا بۆ ناو هەرێم، بەپێی یاسای نێودەوڵەتیی، پێشێلكردنی سەروەری دەوڵەتو بەزاندنی سنووری نێودەوڵەتیی بوو هەر بۆیە مانەوەیان كاتی بوو، بەڵام لەشكركێشیی عێراق جیاواز لەو دوو دەوڵەتە هیچ جۆرە سەرپێچییەكی لەسەر ئەژمار نەكرا، عێراق بۆ مانەوەی هەمیشەیی له هەرێم هێزی یاسایی هەبوو، ئەگەر كاردانەوەی توندی ئەمریكا نەبوایە.

هێزەكانی ی.ن.ك بەرامبەر داگیركردنی هەولێر لەلایەن ڕژێمی عێراقیەوە له باری شۆكیدا بوون، هاوكێشەی ڕێكەوتنی نێوان پ.د.ك و بەغدادیان بۆ ڕاڤە نەدەكرا، ئەمە

---

1وثيقة التضامن: وزارة دفاع، مديرية الاستخبارات العسكرية، العدد: ٨٤/ف/ص، التاريخ: ١٩٩٦/٨/١.

2بيوار هريرى: تحليل الاحداث الاخيرة التى شهدتها كردستان العراقية من ٣١/اب – ١٥/ايلول /١٩٩٦ مجلة ئاڵای ئیسلام ، السنة العاشرة، عددان الثالث والرابع، ١٩٩٦، ل/٨ .

3جوناثان راندل: أمة فى شقاق، ل/٣٨٨.

وایکرد بەردەوام لە پاشەکشەدا بوون، تا ۱۰/سێپتەمبەر/۱۹۹٦ تەواوی دەسەڵاتیان لە هەرێمی کوردستاندا لەدەست داو لەسەر سنووری ئێران گیرسانەوە[١] .

هەڵوێستی تورکیا لەمەڕ ئەم رووداوە جێگای گومان بوو، بۆ تەواوی جیهانو ئەمریکا بەتایبەتی، دوای ئەوەی راپۆرتە هەواڵەکان ئەوەی لەسەرزاری وەزیری دەرەوەی تورکیا چیلەر ئاشکرا کرد، وڵاتەکەی پشتگیری بەغداد دەکات بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی لە هەرێمی کوردستان، بە مەرجێك ئەگەر بتوانێت رێگە لە بەردەم هێرشەکانی پ.ك.ك بگرێت[٢] هەرچەندە دواتر چیلەر ئەم هەواڵەی رەت کردەوە، بەڵام هەڵوێستی ئاشکرای ئەربەکان بە جۆرێك بوو رێگری ئەمریکای کرد، خاکی تورکیا بۆ هێرش کردنە سەر عێراق بەکاربهێنێت. بە ئاشکرا ئەوەی خستەڕوو، ئەمریکا پرۆژەیەکی دیاریکراوی نییە لە هەرێمی کوردستانو عێراق، حکومەتی تورکیا کار بۆ گەشەسەندنی پەیوەندییە ناوچەیەکانی دەکات[٣] .

ئەمریکا، بارزانیی بانگێشتی تورکیا کردو سەرزەنشتی کرد لەسەر هاوپەیمانی کردنی لەگەڵ عێراق[٤]، دواتر لە ۲۰/ئۆکتۆبەر/۱۹۹٦، تاڵەبانی بانگێشتی ئەنقەرە کردو لە ئەنجامی دانوستانێکی چەند رۆژیو لە ۳۱/ئۆکتۆبەر/۱۹۹٦، رێکەوتننامەی ئەنقەرە لە نێوان ی.ن.ك و پ.د.ك واژۆ کرا[٥] . ئەمە لە کاتێکدا بوو ی.ن.ك لە بەرئەنجامەکانی دژە هێرشێکی لە سنووری ئێرانەوە، پارێزگای سلێمانیو کەلارو چەمچەماڵو کۆیەی لە دەستی پ.د.ك دەرهێنا[٦] .

رێکەوتننامەی ئەنقەرە، ۲۲ خاڵی گرنگی لەخۆ گرتبوو، زۆرینەی داڕشتنی تورکیای پێوە دیار بوو، لەوانە خاڵی/١ پێویستە یەکێتیی خاکی عێراق بپارێزرێت، خاڵی/٣ بەرژەوەندی ئاسایشی مەشروعی تورکیاو وڵاتانی دیکە لەم هەرێمەدا لەبەرچاو بگیرێت، خاڵی/٤ نابێت هیچ لایەنێك داوای دەستێوەردانی وڵاتانی دیکە بکات، خاڵی/٥، سنووری نێوان ی.ن.ك و پ.د.ك ی بە فەرمی دیاری کردو لە لایەن هێزی چاودێری ئاشتی ناسراو بە PMF چاودێری دەکرا. ئەم هێزە لە ناوخۆی کوردستاندا بنکەی سەرەکی لە شاری هەولێرو لەدەرەوە بنکەکی لەئەنقەرە بوو. هەردوو خاڵی/۲۱،۲۲ پێناسەی ئاسایشی مەشروعی

---

1 Jonathan Crandal: Iraqi opposition Describes mass Excution near Irbil. Septembri, 1996 www.barm.ucsd.edu

2 EU aid ban highlights shaky Turk rights record 08:04 Sep 22، 1996. www.kurdistanobserver.com.

3 جلال عبدالله معوض: صناعة القرار فی ترکیا، ل/۱۵۳-۱۵٤ .

4 EU aid ban highlights shaky Turk rights record 08:04 Sep 22، 1996. www.kurdistanobserver.com.

5 بڕوانە دەقی ریکەوتننامەکە، پاشکۆی ژمارە/٤ .

6 کریس کۆچیرا:بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، ل/۱٦۳-۱٦٤ .

تورکیایان کردبوو، کە دژایەتی کردنی پ.ك.ك و کارکردن بوو بۆ گێڕانەوەی ئاوارەکانی کەمپی ئەترووش بوو.

بە شیکارکردنی ڕێکەوتنەکە بە روونی دیارە تورکیا بە پاڵپشتی ئەمریکاو بەهۆی PMF خۆی کردۆتە بەشێك لە ڕێکەوتنی کوردی-کوردی، بەپێی خاڵی/٤ دەستێوەردانی ئێران و عێراق بەدوور دەخات و هەردوو لایەنی خستە سەربار بۆ دژایەتیکردنی پ.ك.ك . هەروەها چەمکە سیاسییەکانی وەك "باکووری عێراق" لەبری هەرێمی کوردستان و "کارگێڕی ناوخۆیی کاتی" لەبری حکومەتی هەرێمی کوردستان ی خستە ناواخنی ڕێکەوتننامەکە. دواجار ڕێکەوتنەکە بۆ یەکەم جار تورکمانی لە ڕێگەی PMF لە هەرێمی کوردستان کردە هێزێکی سەربازی و سەنگێکی سیاسیی پێدا، کە بریتی بوو لە ناوەندو چاودێریی دووهێزی بە قەبارەو ژمارە گەورە لەسنوورێکی بەرفراوان، پێبەخشی، ئەم هێزە بڕیار بوو لە پێکهاتەیدا جگە لەتورکمان، کوردو ئاشووریش بەشدار بن، بەڵام دانانی ئەفسەرێکی تورك بە سەرپەرشتیاری هێزەکە بەناوی حەسەن کەپلان[1]، هەروەها نەبوونی هیچ رەگەزێکی کورد یان ئاشوری، ئەوەی سەلماند هێزەکە تورکی-تورکمانی یەو ئامانجی گەورەکردنی دەسەڵاتی تورکیاو تورك نەژادە لە ناو هەرێمی کوردستان.

کۆی گشتی ڕێکەوتنەکە بە بەراوردکردن لەگەڵ ڕێکەوتننامەی پاریس، پاشەکشە بوو لە ستراتیجیی نەتەوەیی کورد، کە هەرێمی کوردستانی بە شێوەیەکی فەرمی یاسایی لە نێوان کورد-کورد دابەشکرد[2]. هەروەها ڕێکەوتنەکە تەنها ئاگربەستێك بوو، تورکیا مەشروعیەتی بەرژەوەندی سەربازی و سیاسیی خۆی سەلماند، ئەوەبوو لە ٢٩/ ئەپریل/١٩٩٧ سەرەك ئەرکانی تورکیا ئەوەی خستەڕوو، ٤٠٠ سەرباز بە تانکەوە چونەتە هێڵی رووبەڕوو بوونەوەی نێوان لایەنە شەڕکەرەکان[3]، هەردوو لایەنی شەڕکەر لە دوای راگەیاندنی ڕێکەوتننامەکە چوار جار بۆ جێبەجێکردنی بەندەکان کۆبوونەوە، بەڵام لە بری چارەسەرکردن، گرفتی نوێ سەری هەڵدا، لەوانە تورکیا ی.ن.ك ی بە پشتیوانی پ.ك.ك تۆمەتبار کرد، هەروەها پ.د.ك لە دەستگیرکردنی ئەندامان و بنەبڕکردنی شانەی ڕێکخستنەکانی پ.ك.ك وە، دەستی بەجێبەجێکردنی بەندەکان کرد، کە نوێنەری پ.د.ك لە

---

1رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە/١٣٩٩، ١٩٩٧/٣/٣١ .

2 بروانە نەخشەی ژمارە/٢ .

3جلال عبد لله معوض: صناعة القرار فی ترکیا، ل/١٧٢.

ئەنقەرە سەفین دزەیی  بە ٣ هەزار ئەندامو لایەنگر، مەزەندەی کردبوو[١]، هەروەها گرفتێکی دیکە ئەوە بوو پ.د.ك  ئاستی نوێنەرایەتیکردنی لە دانوستانەکاندا لە بالاّوە بۆ نزمتر دابەزاند، کەمایەی نیگەرانیو پاشەکشەکردنی شاندی ی.ن.ك  بوو لە ئەنقەرە[٢] .

تالەبانی لە مانگی ئەپریلی١٩٩٧ بەرەو ئەمریکا کەوتە ڕێ، بۆئەوەی بە شێوەیەکی ڕاستەخۆو بەبێ بەکارهێنانی ناوەندی تورکی، لە گۆڕانکارییەکانی هەرێمی کوردستان ئاگاداریان بکات. تالەبانی گومانی هەبوو لە نیەتو ئامانجی تورکیا لە هەرێم، هەروەها خواستی ئەوەبوو تورکیا لە نێوانکاری کورد- کورد  بەدور بخات، هەربۆیە لە کۆبونەوەکانی لەگەڵ ڕاوێژکاری نەتەوەیی ئەمریکا ساموێل بیرکەر و چەند بەرپرسێکی بالاّی کۆشکی سپی، پێشنیاری کرد کۆبوونەوەکان لە ئەنقەرەوە بۆ واشنتن بگوازرێنەوە[٣] . ئەم گومانە بەرەو ڕاستی ڕۆیشت کاتێك تورکیا ٥٠  هەزار سەربازی بە تەواوی چەکی ئاسمانیو زەمینی لەژێر ناوی ئۆپەراسیونی فولاز  ڕژاندە ناو هەرێمی کوردستان کە لە ١٤/مایۆ-٢١/ یونیۆ/١٩٩٧ بەردەوام بوو. تورکیا ئامانجی بنەبڕکردنی تەواوی بنکەکانی پ.ك.ك ی دەستنیشان کردبوو، بەپێی ڕاگەیاندنی سوپای تورکیا لەم  ماوەیەدا، ٢٦٠١  کەسیان لێ کوشتن، لە ریزی سوپای تورکیا ٩٩  کوژراو ٣١٣ بریندارو کەوتنە خوارەوەی دوو کۆپتەر زیانەکان بوون[٤] .

مامەڵەی تورکیا لەگەڵ هەرێمی کوردستان شێوەی لاسەنگکردنی دەسەلاّتو پشتگیریکردنی پ.د.ك و فشارخستنەسەر ی.ن.ك ی وەرگرت. وەزیری بەرگریی تورکیا ڕایگەیاند هێرشەکە لەسەر داوای بارزانی  بووەو بە مەبەستی دەسەلاّت گرتنی بەسەر ناوچەکەدا بووە[٥]، لایەنی دووەم ی.ن.ك  پێی پەسەند نەکراو بوو بەهۆی هەڵگیرسانەوەی شەڕی ناوخۆ لە ١٤/ئۆکتۆبەر/١٩٩٧، ئەمە لە کاتێکدا بوو ١٦  هەزار سەربازی تورکیا بە مەبەستی لێدانی هێزێکی هەزارکەسیی لە گەریلای پ.ك.ك، لە ٢٤/ سێپتەمبەر/١٩٩٧ هاتبوونە ناو قولاّیی هەرێمەوە[٦]، نوێنەری پ.د.ك  لە ئەنقەرە سەفین دزەیی  تەواوی هەماهەنگی لە نێوان پ.د.ك و تورکیا لەم هێرشە سەربازییە ئاشکرا کرد[٧] .

---

1Michel verrier: A trump card for ، turkey- Kurdish guerrillas.1997-2006 Le Monde diplomatique. http://mondediplo.com

2پەخشنامە: یەکیتی نیشتمانیی کوردستان، مەلبەندی ڕیکخستن، ژمارە/٢٦، ١٩٩٧/٩/٢٠ .

3ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە/١٤٤٣، ١٩٩٧/٧/٢٩ .

4رسالة مام جلال: ترکیا تباشر اقامة حزامها العدوانی، التواجد الترکی والحزام الامنی، ١٩٩٧/١١/٦ .

5Turkey invasion of iraq، 1997،www.fas.org\asmp\poofiles\turkey،

6 Ankara bombs northern Iraq from the militant. Vol 61.no-35-13 coctobe.1997 Www. Har ford, Hwp.com:

7 www.kurdistanobserver.com EU aid ban highlights shaky Turk rights record 08:04 Sep 22، 1996

ئامانجی ئەم لەشکرکێشییە تەواوکردنی کارەکانی ئۆپراسیۆنی فولاز بوو بۆ جێبەجێکردنی پشتێنەی ئاسایش لە قوولایی ٥-١٥ کم بە درێژی سنووری نێوان تورکیاو هەرێمی کوردستان، بە بەکارهێنانی تازەترین ئامێری چاودێریو بە هاریکاری پ.د.ك سوپای تورکیا لە خاکی هەرێمی کوردستانداو بەسوود وەرگرتن لە رێکەوتننامەی ئەنقەرە لە ٢٢-٢٤/ئۆکتۆبەر/١٩٩٧، ١٠٠ تانکی تورکیو هەشت هەزار سەرباز بە یەکجاری لە هەرێمی کوردستان نیشتەجێ بوون[1]، لەلایەکی دیکەشەوە لەمیانەی دەستپێکردنەوەی شەڕی ناوخۆ، پ.د.ك و تورکیا جەختیان لەسەر هاوپەیمانی ی.ن.ك و پ.ك.ك کردەوە، بارزانی رایگەیاند ئاشتی لەگەڵ تاڵەبانی ناکات تاکۆتایی بە هاوپەیمانی لەگەڵ پ.ك.ك نەهێنێت[2]، فڕۆکەکانی تورکیا بە بەهانەی بەزاندنی سنووری دیاریکراوی خۆی، هێرشێکی چەند رۆژییان لە هێڵی روبەڕوبوونەوەی شەڕ، بۆ سەر هێزەکانی ی.ن.ك ئەنجام دا. سەرچاوە تورکیەکانیش ئەو راستیەیان دوپات کردەوە کە هێزی پیادەی تورکی یارمەتی بارزانی لەدژی تاڵەبانی داوە[3]،بەم جۆرە تورکیا راستەوخۆ بەشداری شەڕی ناوخۆی هەرێمی کوردستانی کرد.

تاڵەبانی نامەیەکی ئاڕاستەی وەزیری دەرەوەی تورکیا ئیسماعیل جەم کرد، کە تیایدا هاتبوو فڕۆکەو سەربازی تورکیا ١٢ چەکداری (ی.ن.ك) و ٨ سیڤیلیان کوشتووە[4]، لەلایەکی دیکەشەوە ی.ن.ك لەناوەندی نێودەوڵەتیداو لە رێگەی نوێنەرەکانەوە، هەواڵی بەشداریکردنی سوپای تورکیای لە شەڕی ناوخۆی هەرێمی کوردستاندا بڵاوکردەوە[5].

ئەمریکا دوای ئەوەی لە ئاڵۆزکردنی کێشەی هەرێم لەلایەن تورکیاوە دڵنیا بووەوە، لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا جێگری یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دیڤید وێلش لەگەڵ هەریەك لە بارزانی و تاڵەبانی ئەوەی خستەڕوو کە واشنتۆن راستەخۆ دەبێتە ناوبژیوانو سەرپەرشتیاری ئاشتیی لە نێوان هەردولا[6]، بۆ ئەم مەبەستەش لە ناوەڕاستی مانگی یۆلیۆ١٩٩٨ گەیشتە هەرێمی کوردستانو بەبێ بەشداریکردنی تورکیا لە دانیشتنەکانی

---

1Alain Gresh: from the golf to Kurdistan، winds of war ruffle the middle east1997-2006 Le Monde diplomatique.www.mondediplo.com

2 Salahuddin:Iraq northern، dateline iraq،kurds، 1/12/1998،at voiced،www.fas.org

3القتال العنيف بين الفئات الكردية من جهود تركية وبريطانية وامريكية، العراق، الجيش، ١٦\١٠\١٩٩٧ www.arabicnews.com.

4 رسالة جلال طالباني: السيد وزير الخارجية التركية الاستاذ اسماعيل جم المحترم،١٧\١٠\١٩٩٧ .

5 رسالة جلال طالباني: تركيا تباشر اقامة حزامها العدواني، التواجد التركي والحزام الامني،١٩٩٧/١١/٦ .

6 کوردستانی نوێ ژمارە/ ١٥١٤ ، ١٩٩٧/١٢/١٩ .

هەردوولا، وتوێژەکان بۆ گەڵاڵەکردنی ڕێکەوتننامەیەك دەستی پێکرد[1] . سەرئەنجام بارزانی و تاڵەبانی لە ١٧/سێپتەمبەر/١٩٩٨ بانگهێشتی واشنتۆن کرانو بە ئامادەبونی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا مادلین ئۆڵبرایت سەرکردەی هەردوو پارتەکە ڕێکەوتننامەی واشنتۆن یان لە ئەمریکا ڕاگەیاند.

ڕێکەوتنەکە هەشت بابەتی لەخۆ گرتبوو، یەکەمیان جەختکردنەوە لەسەر دەستکەوتەکانی پێشوو کە هەردوو پارتەکە پابەندی خۆیان بە عێراقێکی یەکگرتوو دوپاتکردەوە، ڕۆڵی تورکیایان لە پێناوی پرۆسەی ئاشتیدا بەرز نرخاند، لە بابەتی دووەمدا بە ناوی قۆناغی گواستنەوە ڕێکەوتن لەسەرئەوە کرا کە بەهیچ جۆرێك پەنای پ.ك.ك لە هەرێمی کوردستاندا نەدرێت، ئەمە وەك گرەنتییەك بۆ تورکیا. بۆ ئەم مەبەستە ئەنقەرە دیاری کرابوو بۆ شوێنی کۆبوونەوەکان سەبارەت بە لەناوبردنی تیرۆر مەبەست پ.ك.ك بوو، هەروەها بۆ تۆکمە کردنی سنوورەکانی هەرێمی کوردستان.

هەرچی بابەتەکانی تریش بوو، بریتی بوون لە"ئیدارەی یەکگرتوو"، "هاوبەشی لە داهات"، "بارودۆخی هەولێرو دهۆكو سلێمانی"، "هەڵبژاردن"، "بارودۆخی هەرێمی کوردستانی عێراق" کە جێگای نارەزایی تورکیا بوون، چونکە بە رونی باس لە چەند بابەتێك کرابوو، وەك هەرێمی کوردستانی عێراق، فەرماندەی پێشمەرگە، هاریکاری نێوان ئەنجومەنی هەڵبژێدراو پەرلەمان و کۆمەڵەی نێودەوڵەتیی[2]. سەرەڕای ئەوە تورکیا بە گومانەوە لە کۆبونەوەکانی نێوان کوردو رۆژئاوای روانی، بەتایبەت لەم ڕێکەوتنە کە جیاواز لەڕێکەوتنەکانی پێشوو، بەبێ بەشداری تورکیا بەڕێوە چوو، جێگری سەرەك وەزیران ئەجەڤیت وەك هەڵوێستێکی تورکیا ئەوەی خستەڕوو کە پێویستە ڕێکەوتنەکە لەلایەن تورکیاوە تاوتۆێ بکرێت[3]، بارزانی دەوڵەتانی ناوچەی دڵنیاکردەوە کە ڕێکەوتنی واشنتۆن نابێتە هەڕەشە بۆسەر هیچ دەوڵەتێك[4]، بۆ ئەم مەبەستە هەریەك لە بارزانی و تاڵەبانی لە ٩/نۆڤەمبەر/١٩٩٨ لەگەڵ سەرەك وەزیرانو جێگرەکەیو وەزیری دەرەوە بۆ تاوتۆێکردنی رەواندنەوەی مەترسییەکانی تورکیا لە ڕێکەوتنەکە کۆبونەوە[5] .

---

1 کوردستانی نوێ ژمارە/ ١٦٥٦، ١٨/٧/١٩٩٨ .

2 بروانە دەقی ڕێکەوتنامەکە،پاشکۆی ژمارە/٥ .

3 رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە/١٧٠٦، ٢٧/٩/١٩٩٨.

4 www.vsi washingtonfile.com: transcript: Albright، talabani، barzani، remarks، 27-9-1998.

5 رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە/٥٧١١ ، ١٠/١٠/١٩٩٩.

لە کۆتایی ئەم باسەدا ماوە بڵێین پەیوەندییەکانی نێوان هەرێمی کوردستانو تورکیا لە ماوەی ١٩٩٦-١٩٩٨، چەند دیاردەیەکی بەخۆوە بینی لەوانە:

١- دیاردەی کۆچکردن: شەڕی ناوخۆ لەهەرێمی کوردستان، کاریگەریی سلبی لەسەر کۆمەڵگای کوردی لەڕوی سیاسییو ئابووریو کۆمەڵایەتی بەجێهێشت، لە ناویاندا سەرهەڵدانی دیاردەی کۆچکردنی دەرەکی بوو. بەواتا کۆچی دانیشتوانی کوردستان بەرەو رۆژئاوا، کەرێگای سەرەکییان تێپەڕبوون بوو بەناو خاکی تورکیادا، کۆچ لەگەڵ درێژبونەوەی شەڕی ناوخۆ ساڵ بەساڵ زیاتر دەبوو، بەجۆرێك ساڵی ١٩٩٧، ١٧٧٢٩ کەس لە رێگای ئیبراهیم خەلیلەوە هەرێمی کوردستانیان بەجێهێشت، شێوەی رۆیشتنەکەیان لە رێگای ئەو ڤیزانەوە بوو کە تورکیا رۆژانە بە رێژەیەکی دیاریکراو بە پ.د.ك و بەرەی تورکمان ی بەخشیبوو، ئەم کۆچکەرانە بۆیان هەبوو تەنیا ١٥ رۆژ لە ناو تورکیا بمێننەوە، دواتر ئەبوو بگەڕێنەوە هەرێمی کوردستان، یان تورکیا بەجێ بهێڵن[1]، جگە لەم شێوەیە زۆرینەی کۆچکەران ئەو کەسانە بوون، بە شێوەی نایاسایی بەناو خاکی تورکیادا تێدەپەڕین، لە کاتی دەسگیرکردنیاندا تورکیا لە رێگای ئیبراهیم خەلیلەوە ئەمدیوی سنووری هەرێمی کوردستانی دەکردنەوە، بۆ نموونە بەپێی راپۆرتی ساڵانەی خاڵی سنووری ئیبراهیم خەلیل لە ساڵی ١٩٩٧، ژمارە کۆچکەرانی ٢٦٣٣ کەس بوون[2].

٢- پێشێلکاری مافی مرۆڤ: ئۆپەراسیۆنی سەربازی بەرفراوانی سوپای تورکیا لە هەرێمی کوردستان، لە ئەنجامی بەکارهێنانی سیاسەتی سەربازی "زەوی سوتاو"، چەندین پێشێلکاری مافی مرۆڤی لەخۆ گرتبوو، ئامانجی ئەم شێوازە کارکردنەی سوپا، هەڵکەندنی بنکەی مانەوەی پ.ك.ك بوو، ئەویش بەتێکدانو رووخاندنی ئەو دێهاتانەی پ.ك.ك بۆ مانەوە پشتی پێدەبەستن. لەلایەکی تریشەوە پ.ك.ك بەهۆی شەڕەکانی لەگەڵ تورکیاو پ.د.ك، ئەو گوندانەی دەسوتاند کەئەندامو لایەنگری پ.د.ك یان تیادابوو. لە راپۆرتی پارێزگای دهۆك، تەنها لەئەنجامی لەشکرکێشیی ساڵی١٩٩٧، تورکیا لە ٨٢١ گوندی سنووری قەزاکانی دهۆك، زاخۆ، سمێڵ، ئامێدی، شێخانو ئاکرێ، ٢٧٠ گوند بە

1 سەلاح صدیق سعیدو هاوڕێکانی: دیاردەی کۆچکردن بۆ دەرەوەی ولات لە کوردستانی باشوور١٩٩٧-١٩٩٨، توێژینەوەی دەرچوون، بلاونەکراوەتەوە، بەشی کۆمەلناسی، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٩٨، ل/٧٦-٧٧.

2 سەلاح صدیق سعیدو هاوڕێکانی: دیاردەی کۆچکردن بۆ دەرەوەی ولات لە کوردستانی باشوور، ل/٧٨.

رووخان و سوتان لەناوچوون و ژمارەی ئەو کەسانەش کە زەرەرمەند بوون ١٠٨٧٢٧ کەس بوون، واتە ١٥,٥٪ ی پارێزگای دهۆك[1] .

٣- پێشێلکردنی یاسای پەنابەرێتی نێودەوڵەتیی: لە ئەنجامی شەڕی نێوان پ.ك.ك و سوپای تورکیا، باکووری کوردستان لە ساڵی ١٩٩٤ توندوتیژییەکی توندی بەخۆوە بینی، دوو هەزار خێزان لە سنووری هەرێمی کوردستان پەڕینەوەو بە هاوکاریی لەنێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و رێکخراوی UNHCR ی نێودەوڵەتیی، لە کەمپی ئەتروش، نیشتەجێکران. ئەو پەنابەرانە لەلایەك بوونە فشار لە رووی پێشێلکارییە بەرچاوەکانی مافی مرۆڤ[2]، لەلایەکی تریشەوە تورکیا ئەوەی لەبەرچاو بوو کە ئاوارەکانی ساڵی ١٩٨٨و ١٩٩١ی هەرێمی کوردستان رایەکی مەزنی جیهانیان بەدەستهێنا و بوونە سەرەکیترین هۆکاری دابڕینی هەرێمی کوردستان لە دەوڵەتی عێراق، لەم روانگەیەوە بە مەبەستی گەڕانەوە بەردەوام بڕیاری لێخۆشبونی بۆ دەرکردن، بەڵام ئەوەی تورکیای نیگەران کرد، دزەکردنی پ.ك.ك بوو بۆ رێکخستنی کاری چەکداری لە ناو ئاوارەکاندا[3] . ئەمە هۆکاری سەرەکی بوو تورکیا لە رێکەوتننامەی ئەنقەرە لە ساڵی ١٩٩٦ لە بەندی ٢٢ ئەوە جێبکاتەوە کە ئەتروش لە بری کەمپی پەنابەری بە سەربازگە ناوببرێت، بەپێی رێکەوتننامەکە، بڕیاری داخستنی درا[4]، ئەنجام لە ئۆپەراسیۆنی ١٩٩٧، سوپای تورکیا رووی کردە کەمپەکەو کردیە سەربازگەی خۆی[5]، ئاوارەکان هەندێکیان گەڕانەوە تورکیاو زۆرینەیان رویانکردە سنووری دەسەڵاتی حکومەتی عێراقی لە سنووری شارۆچکەی مەخمور نیشتەجێ بوون[6]

٤- لەقبوونی هاوپەیمانیی نێوان پ.د.ك و تورکیا:

تورکیاو پ.د.ك چەندین بەرژەوەندی هاوبەش کۆی کردبوونەوە، لەوانە دژایەتیکردنی پ.ك.ك، بەرگرتن لە دەسەڵاتی ئێران لە هەرێمەکە، پەیوەندیکردن لەگەڵ عێراقدا بەتایبەت

---

1 مكتب العلاقات والاعلام بمحافظة دهوك، الاضرار الناجمة عن تراجد عناصر پ.ك.ك في محافظة دهوك ، مجلة متين ، ١٩٩٧، ل/٦٤-٦٥.

2 LEE H. HAMILTON: PROPOSED SALE OF ARMY TACTICAL MISSILE SYSTEM TO TURKEY، Page: E2333] MONDAY، DECEMBER *11، 1995*

3 Nivisingeha peywendiyan u ragehandine li parezgeha duhuk، 28-32

4 بڕوانە دەقی رێکەوتننامەکە،پاشکۆی ژمارە/ چوار.

5 هاوڕی باخەوان: هاوڕێنامە، ل/٤١٨.

6 Nivisingeha peywendiyan u ragehandine li parezgeha duhuk، 106-107

له رووی بازرگانییەوە، هەڵوێست وەرگرتن له بەرامبەر ی.ن.ك دا. بەڵام سەرەڕای ئەوە خاڵی جیاوازی نێوانیان تورکمان بوو، تورکیا خواستی ئەوەبوو له ڕێگەی ڕێکەوتننامەی ئەنقەرە شێوەی هێزی PMF سەنگێکی سیاسیی بداتە تورکمان، کە لە دواڕۆژی هەرێمی کوردستانو عێراقدا سوودیان لێ وەربگرێت، تورکمان لای خۆیانەوە ئەم پاڵپشتییەی تورکیایان بەکاردەهێنا له پیادەکردنی جۆرە دەسەڵاتێکی ناوخۆیی لەناو هەولێر، ئەمە لەلایەن پ.د.ك ەوە، وەك خاوەن دەسەڵات بەسەر پایتەختو پەرلەمانو حکومەت، پەسەند نەبوو، هەر بۆیە هۆکاری سەرەکی بوو لە ١٠/ئۆگستوس/١٩٩٨دا تەواوی بارەگای لەلایەن هێزی پ.د.ك دەستی بەسەرداگیراو[1]، ئەمەش بووە مایەی نارەزایی تورکیاو رای گشتی ئەو دەوڵەتەو تورکیا داوای قەرەبووی زیانەکانی لە پ.د.ك کرد، له ڕاگەیاندنەکان بە دژایەتیکردنی رەگەزی ناوبرا[2]، ئەمە خاڵی سەرەتابوو بۆ ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو پ.د.ك .

---

1جريدة الشرق الاوسط، عدد ٧٠٨٨ ، ١٩٩٨/٤/٢٥. یوسف گوران: بەرەی تورکمانیو لێکولینەوەیەك لەبارەی بیری ناسیۆنالزمی تورکییەوە، گۆفاری سەنتەری لێکولینەوەی ستراتیژی، ساڵی سیانزەهەم، ژمارە/٢ ، ٢٠٠٣، ل/١٥٥.

2 یوسف گوران: بەرەی تورکمانیو لێکۆڵینەوەیەك لە بارەی بیری ناسیۆنالیزمی تورکییەوە، ل/١٥٥.

# تەوەرەی یەکەم

## عێراق:

دوای سەرنەکەوتنی دانوستانەکانی عێراق لەگەڵ بەرەی کوردستانی لە سەرەتای ساڵی١٩٩٢دا عێراق دەستبەرداری هەرێم بوو، ستراتیژی بریتی بوو لە هەڵپەساردنی کێشەی کورد تائەو کاتەی عێراق لە تەنگەژە نێودەوڵەتیەکان قوتار دەبێتو پاشان بە بەکارهێنانی یاسای ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٧٤و پرۆژەی رێکەوتنی ساڵی١٩٩١، دەسەڵاتی ناوەندی خۆی دەسەپێنێت[1].

گرفتی سەرەکی عێراق لە بەرامبەر تورکیا لەوەدا بوو، کە هەرێمی کوردستان بەربەستێکی جوگرافی بوو لەبەردەم بەریەککەوتنی سنوورو پەیوەندییە راستەوخۆکانی لەگەڵ تورکیا، هەروەها گرفتی لەگەڵ هەرێمی کوردستان بریتی بوو لەوەی کە بەپێی بڕیاری ٦٨٨ پاریزراوییەکی نێودەوڵەتیی بۆ پەیدابوو، کە رێگربوو لەبەردەم گەڕانەوەی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی بەغداد بۆ هەرێمی کوردستان.

لە بەرامبەردا ستراتیجی تورکیا بریتی بوو لەوەی کاتێك دەتوانێت هەرێمی کوردستان پشتگوێ بخات، کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق ئاسایی بێتەوەو سوپای

عێراق سنوورەکان بگرێتەوە دەست[2]، لەم روانگەیەوە پەیوەندییەکانی نێوان عێراقو تورکیا لە ساڵانی نەوەدەکاندا دوو قۆناغی بەخۆوەبینی:

- **قۆناغی ئۆزال ١٩٩٠- ١٩٩٣**

ئەم قۆناغە تایبەت بوو بە نەبوونی سەرجەم پەیوەندییەکانی نێوان عێراقو تورکیا کە بە هەڵوێستی تورکیا دەست پێدەکات، ئۆزال بە ئاشکرا لە کاتی دووەمین جەنگی کەنداو داوای رووخانی رژێمی عێراقی کردو لەگەڵ لێدانی سەربازیو دژی بەکارهێنانی چارەسەری دیپلۆماسی بوو، سەرۆك کۆماری تورکیا بڕوای وابوو، ئەستەمە بتوانێت باوەڕ بە مانەوەی

---

1الموقف العرب من تطورات المسألة الكردية في العراق، www.Almqatl.com .

2ارسين كلاسي أوغلو، السياسة الخارجية التركية أزاء الامن الاقليمي التعاون في الشرق الاوسط العلاقات العربية التركية الى أين، من كتاب مجموعة باحثين: العرب وحوارهم ... الى أين، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠٠٠، ل/٢٤٠.

سەرۆکێك بکات لە ماوەی ١٢ساڵدا، واتە ١٩٧٩-١٩٩١، نۆ ساڵ گەلەکەی خستبێتە جەنگەوە[1] .

لەم روانگەیەوە ئۆزال متمانەی بەڕژێمی عێراق نەمابوو، کە سەرچاوەی کێشەو نائارامی بوو، بەڵکو کاری لەپێناوی لاوازکردنو رووخانی ئەو رژێمە دەکرد کە لە سەرەمەرگدایە، بۆ ئەم مەبەستەش بازنەی کارکردنی هەرێمی کوردستان بوو.

## • قۆناغی دوای ئۆزال ١٩٩٣-١٩٩٨

ئەم قۆناغە لە دوای مردنی ئۆزال دەست پێدەکات دوای ئەوەی تەمەنی رژێمی عێراقی لەسەر کورسی دەسەڵات درێژەی کێشا، سیاسەتی تورکیا بە تێپەڕبوونی کات لەگەڵ عیراق نزیك دەبووەوە لە روانگەی ئەم خاڵانەی خوارەوە:

- پچڕاندنی پەیوەندییە دوو قۆڵیەکان گەورەترین گرفتی ئابووری بۆ هەردوولا پەیدا کردووە.
- کێشەی کورد لە هەریەك لەو دوو دەوڵەتە، پەیوەندیی بە دەوڵەتەکەی ترەوە هەیە.
- پێویستە هەرێمی کوردستان دوور بخرێتەوە لە هاوکێشە نێودەوڵەتیەکانو لە سنوورێکی ناوچەییدا چارەسەر بکرێت.

لە فەبرایەری١٩٩٥، وەزیری دەرەوەی عێراق محەمەد سەعید سەحاف سەردانی ئەنقەرەی کرد، داوای لە تورکیا کرد مۆڵەتی مانەوەی هێزی نێودەوڵەتیی ناوچەی دژەفڕین درێژ نەکەنەوە، هەروەها کێشەی کورد وەك کێشەیەکی ناوخۆیی لە هەردوولادا سەیر بکرێتو هیچ لایەنێکی نێودەوڵەتیی دەستی تێوەرنەدات[2] .

لەم قۆناغەدا سەردانە فەرمییەکان لە ئاستی وەزیراندا لە نێوان هەردوولا دەستی پێکردەوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٦-١٩٩٧ هەرێمی کوردستان دوو رووداوی گرنگی بەخۆوە بینی کە کاریگەرییان لەسەر پەیوەندییەکانی نێوانیان پەیدا کرد.

## ١) رووداوی ٣١/ئۆگستۆس /١٩٩٦

پایتەختی هەرێمی کوردستان لەسەر بانگێشتی بارزانی لەلایەن سوپای عراقییەوە داگیر کرا، هەرچەندە لەشکرکێشیی سوپای عیراق کاتی بوو، بەڵام ئەم رووداوە بە هێڵی گەیاندنی تورکیا- پ.د.ك- عێراق دادەنرێت، چونکە بەرژەوەندی ئاسایی بوونەوەی پەیوەندییەکانی

1 Amikam nachmani: turkey in the wake of the gulf ware،1999.www.faind articles .com.

2 عومەر نورالدین : سیستەمی نوێی جیهانیو دۆزی کورد، ل/٣١٢.

نێوان عێراق‌و تورکیا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی پ.د.ك یەکانگیر بوون. پ.د.ك سوودێکی زۆری لەو رووداوە وەرگرت کە تەرازووی هێز بە قازانجی ئەو لە هەرێمی کوردستان لاسەنگ بوو، بەڵام عێراق بەهەمان شێوە لە میانەی ئەو لەشکرکێشییە توانی پیلانێکی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا CIA پوچەڵ بکاتەوە، کە لەگەڵ کۆنگرەی نیشتمانی عیراق INC، بە مەبەستی رووخاندنی رژێمی عێراق دایرێژا بوو[1]، ئەم هاوپەیمانییەی نێوان پ.د.ك و عێراق لە کاتێکدا بوو ٤-٥ هەزار هێزی بەدر ی ئەنجومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامی عیراق لە سنووری دەسەڵاتی ی.ن.ك مۆڵیان دابوو بۆ پیلانێکی هەماهەنگ لەگەڵ هێزە بەرهەڵستکارەکانی عیراق بە مەبەستی رووخاندنی رژێمی عیراق[2]. پ.د.ك ئەمەی بە هەرەشە وەرگرت‌و داوای یارمەتی لە عیراق کرد بۆ دژایەتیکردنی ئێران‌و هاوپەیمانەکەی ی.ن.ك، ئەوە بوو ٣١/ئۆگستۆس/١٩٩٦ گاردی کۆماری عیراق هەولێری داگیر کرد[3]، سەرجەم ئەم هاوکێشانە بوونە هۆی لاوازبوونی سەروەریی‌و ئاسایشی نیشتمانیی هەرێمی کوردستان هەروەها بەهێزبوونی ئەم هێڵە لە بەرامبەر هێڵی ی.ن.ك و ئێران، ئەوەی ئەم هاوپەیمانییەی بەهێز کرد هەڵگرتنی فشاری ئابووری بەغداد بوو لەسەر سنووری دەسەڵاتی پ.د.ك لە ٩/سێپتەمبەر/١٩٩٦. هەروەها بەرزبوونەوەی دەنگۆی دانوستان بوو لە نێوان پ.د.ك و عێراق کە لەسەر زاری تەها یاسین رەمەزان، جێگری سەرۆکی عێراق، دووپات کرایەوە[4] .

### ٢) رووداوی لەشکرکێشیی ساڵی ١٩٩٧و دروستکردنی پشتێنەی ئاسایش:

لەشکرکێشیی ساڵی ١٩٩٧ جگە لەوەی گەورەترین ئۆپەراسیۆنی سەربازی تورکیا بوو لە خاکی هەرێمی کوردستان، هاوڕێ لەگەڵیدا پیلانی پشتێنەی ئاسایشی بەدوای خۆیدا کێشکرد کە ئەمە بۆ عێراق جێگای مەترسی بوو، چونکە سوپای تورکیا جیاواز لە پێشوو،

---

1. ١٨-٣٠١/ل ،اندرو كوكبورنو زميله: صدام الخارج من تحت الرماد How is it possible that Saddam Hussein is still in power in Baghdad? An interview with, Dr. Ahmad Chalabi www.pbs.org.

2 روبرت اولسن: المسألة الكردية، ل/٦٨.

3 تقرير من الاستخبارات من الشمال الرقم/١، للفترة من ك ١٩٩٧ ولغاية ا/شباط/ ١٩٩٧، الملحق/١، بامر الحركات الرقم/ ١ .

4 عايدةعلي سري الدين: دول المثلث بين فكي الكماشة التركية الاسرائيلية، دار الفكر العربي، بيروت، ١٩٩٧، ل/٢١. جلال عبد الله معوض: صناعة القرار في تركيا، ل/١٦١.

Turkey Has 1،357 Military Personnel In North Turkey Has 1،357 Military Personnel In North Of Iraq Of Iraq Published: 3/3/2005،www.turkishpress.com

بۆ ماوەیەکی نادیار لە هەرێمەکەدا خۆی چەسپاند*، عیراق ئەم لەشکرکێشییانەی بە پێشێلکردنی سەروەریی خاکی عێراق لەقەڵەم دا.

لەلایەکی تریشەوە ئەگەری ئەوە هەبوو تورکیا چۆن ئەسکەندەرۆنەی لە سوریا داگیر کردووە، بەهەمان شێوە بەناوی پشتێنەی ئەمنی ناوچەکە داگیر بکات، پاش ئەوەی بە ئاشکرا ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا بە سەرۆکایەتی دیمریل ی سەرۆك کۆمار لە سێپتەمبەری١٩٩٦ بریاری لەسەر پێکهێنانی ئەو پشتێنەیە دابوو بە قولایی ٥/کم و بە درێژایی سنووری هەرێمی کوردستان – تورکیا[١].

رژێمی عێراق هەرچەندە بە ئاشکرا نارەزایی خۆی لەم لە شکرکێشییانە دەردەبرِی بەلاّم بە شێوەیەکی نافەرمی مامەڵەیەکی هێورکردنەوەی لەگەڵ تورکیادا بەکاردەهێنا، چونکە خواستی ئەوەی نەبوو کە بەتەواوی پەتی پەیوەندیی نێوان تورکیاو عێراق بپچرێنێت، هەروەها توانای سەربازی لەگەڵ تورکیادا زۆر نایەکسان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئۆپەراسیۆنەکان بە هاریکاری پ.د.ك، دەبووە هۆی لاوازبوونی ئێران، دواجار هێزی کوردیش لە هەرێمی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی بەرەو لاواز بوون دەچوو[٢].

رووداوەکانی هەرێمی کوردستان کاریان کردە سەر سەنگی سیاسیی عێراق. بەتایبەت دوای ئەوەی رێکەوتننامەی ئەنقەرە هاریکاریی سیاسییی لایەنە شەرکەرەکانی قەدەغە کرد، هەروەها رێکەوتننامەی واشنتۆن لەم بارەیەوە رۆڵی هەبوو، دیڤد وێلش بەئاشکرا رایگەیاند کە یەکێك لەئامانجی رێکەوتنەکە ئەوەیە هێزە کوردییەکان پەنا نەبەنە بەر هێزە رکابەرەکانی واشنتۆن لە ناوچەکەدا[٣]، بەلاّم ئەوەی کاریگەی لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان هێلی هاوپەیمانی تورکیا- پ.د.ك- عێراق کرد، ئاوارەکانی کەمپی ئەتروش بوو، کە چوونە سنووری دەسەلاّتی عیراق، لە کەمپی مەخمور نیشتەجێکران، و تورکیا وەك هەرەشەیەکی گەورە لێیڕوانی[٤].

---

* سوپای تورکی تاساڵی ٢٠٠٥، ١٣٥٧ سەربازی لەناو هەرێمی کوردستاندا هەبووە.

1 جلال عبد الله معوض: صناعة القرار فی ترکیا، ل/١٦٢-١٦٣.

2 الموقف الأقلیمی والعالمی اثناء العملیات العسکریة الترکیة فی شمال العراق، منطق الاکراد، کردستان، موضوعات سیاسیة .

3 رۆژنامەی کوردستانی نوێ، زمارە ١٦٥٦، ١٩٩٨/٧/١٩ .

4 *Human Rights Watch:* Turkey and War in Iraq: Avoiding Past Patterns of Violation. ، *March 2003*.

، *March 2003*،www.hrw.com.

# تەوەرەی دووەم

## سوریا:

پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو سوریا لە نەوەدەکان وەك پەیوەندییەکی ئاسایی نێوان دوو دەوڵەتی دراوسێ بەڕێوە نەچوو، چونکە هەردوولا چەند کێشەیەکی مێژوویی لەنێوانیاندا هەبوو کە ئەمانە بوون:

- داگیرکردنی لیوای ئەسکەندەرونە هاتای سوریا لەلایەن تورکیاوە لە ١٩٣٧.
- لە جەنگی ساردی١٩٤٥-١٩٩٠، تورکیا هاوپەیمانی بلۆکی سەرمایەداری بوو بە سەرکردایەتیی ئەمریکا، لە کاتێکدا سوریا لە ناو بازنەی سیاسەتی بلۆکی سۆسیالستی بوو بە سەرۆکایەتی یەکێتیی سۆڤیەت.
- تورکیا کێشەی ئاسایشی هەبوو لەگەڵ سوریا کە بە پشگیری سەرەکی پ.ك.ك، تۆمەتباری دەکرد.
- سوریا کێشەی ئاوی لەگەڵ تورکیا هەبوو، چونکە پرۆژەی گاپ (GAP)ی تورکیا کۆنترۆڵی ئاوی فوراتی بۆ ناو سوریا کردبوو، کە لە ٨٥٪ ئاوی شیرینی بۆ سوریا دابین دەکرد[١].

سەرەڕای هەموو ئەو کێشانە سوریا لە پاڵ تورکیاو ئێران چالاکانە بەشداری کۆبوونەوە سێ لایەنەکانی کرد، لەم بارەیەوە ئەوەی بایەخی سوریای کەم کردەوە، ئەو سنوورە چەند کیلۆمەترییە بوو لەگەڵ هەرێمدا کە ڕێگەی نەدەدا بە سوریا وەك ئێرانو تورکیاو عیراق دەست بخاتە کاروباری هەرێمی کوردستان. لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ سوریاو تورکیا لە نەوەدەکان ململانێی ئاسایشو ئاویان گواستبۆوە بۆ ناو هەرێمی کوردستان، بەجۆرێك سوریاو پ.ك.ك ی لەخاكو سەربازگەو چەك بەهرەمەند دەکردو لە خاکی هەرێمی کوردستانەوە لە دژی تورکیا بەکاری دەهێنا، سوریا بێباك بوو لە یارمەتیدانی ئەو ڕێکخراوە، چونکە پ.ك.ك. بەراشکاوی باوەڕی بەکوردستانی سوریا نەبوو، پ.ك.ك. پێی وابوو، ئەوەی کوردی سوریایە ئاوارەو کۆچکردوون بە درێژایی مێژووی نوێو هاوچەرخی تورکیا بەرەو ئەو وڵاتە وەدەرنراون[٢]، هاوکات سوریا لەبارەی بەدەستهێنانی مافی کورد لەتورکیا کێشەی نەبوو، چونکە لەوە دڵنیابوو تورکیا بە هیچ شێوەیەك لەم بارەیەوە سازش

---

1 محمد نور الدين : تركيا في زمن التحول، ل/٢٥٩-٢٦٠.

2 يوسف الجمهاني: اوج الان، ل/٦٦-٦٧.

ناکات، هەموو ئەمانە وایان کرد پشتیوانی ئەم پارتە کوردییە بکاتو وەك کارتێکی فشار بەکاری بهێنێت لەبەرامبەر تورکیا بۆ سازشکردن لەکێشەی ئاو[1]، لەلایەکی تریشەوە بەهۆی پ.ك.ك هێڵێکی باریکی پەیوەندیی ئێران- سوریا ی لە بەرامبەر هێڵی گەمارۆی ناتۆ- تورکیا-ئیسرائیل دارشتبوو، کە وەك دەروازەیەکی دەرەکیو هاوپەیمانی نافەرمی بەکاری دەهێنا.

پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو سوریا لەسەروبەندی شەری ناوخۆی هەرێمی کوردستان ئالۆزی بەخۆوە بینی، لەبەرئەنجامی هێرشی سوپای تورکیا لەدژی پ.ك.ك، لەناو خاکی سوریادا، ٣١ هاولاتی سوری، لەساڵی١٩٩٤ کوژران[2] . لەلایەکی دیکەشەوە لەشکرکێیشی تورکیا، بێگوێدانە رێکەوتنەکانی کۆبونەوەی سێلایەنە، هۆکاری یەك هەڵوێستی نارەزایی سوریاو ئێران بوو لە بەرامبەر سیاسەتی تاکلایەنەی تورکیا لە هەرێمەکە، بە تایبەتی لە دوای لەشکرکێشکەی ساڵی١٩٩٥، کە هۆکاری ئامادەنەبوونی ئێرانو سوریابوو لە کۆنگرەی خولی شەشەمی کۆبونەوی سێلایەنە لە ئەنقەرە[3] .

تورکیا بۆ رێگرتن لە سیاسەتی ناوچەیی سوریاو ئێران، پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیل بەتین کردو هاوپەیمانییەتی سەربازی لە ٢٣/ فەبرایر/١٩٩٦ لەگەڵ واژۆ کرد، کە یەکێك لە ئامانجەکانی، پچراندنی هێڵی سوریا— ئێران بوو، کە لە سنووری هەرێمی کوردستانەوە تورکیای پێ گەمارۆ درابوو، بەلام بەم رێکەوتنە سوریای خستە داوی هاوپەیمانیەتی تورکیا— ئیسرائیل و لەباری جێبەجێکردندا، لە ئۆپەراسیۆنی ساڵی ١٩٩٧ بەروونی دەرکەوت، لە رۆژهەلاتی تورکیاوە بۆ باکوورو پاشان بۆ رۆژئاوا تاگەیشتە دەریای سپی، گەمارۆیەکی سەربازی بەشێوەی نیوەبازنەیەك لەسەر سنووری سوریا پەیدا بوو[4] .

مەترسیی تورکیا لە هێڵی ئێران-پ.ك.ك-سوریا لەوەدابوو، تورکیا زانیاریی تەواوی لەبەردەستا بوو کە ئێران موشەکی سکۆت ی دەسکردی دەوڵەتی روسیای گەیاندۆتە سوریا، ئەگەری ئەوە هەبوو ئەو مووشەکانە بکەونە دەستی پ.ك.ك، هاوکات ئیسرائیل ئاگادار بووەوە، ئەم موشەکانە بەدەستی سوریاوە هەرەشەن بۆ سەر ئاسایشی نیشتمانی، لەم خاڵەوە

---

1 خلیل علی مراد: العلاقات السوریة الترکیة فی ضوء أزمة أوج ألان، تشرین الاول، أوکتوبر، ١٩٨٩٨، مجلة أوراق ترکیة معاصرة، مرکز الدراسات الترکیة — جامعة الموصل، عدد ١٦، ٢٠٠١، ل/٧٢.

2 هەمان سەرچاوە: ل/٧٣-٧٤.

3 روبرت اولسن : المسألة الکردیة، ل/٦٦.

4 عونی عبد الرحمن سبعاوی: أنعکاسات التحالف الترکی الصهیونی ومحاولة التأثیر فی الامن القومی العربی، مجلة دراسات السیاسیة، العدد الثانی السنة الاولی ١٩٩٩، ل/٤٢.

هاوپەیمانیی تورکیا-ئیسرائیل بەتینتر بوو، وەزیری بەرگری تورکیا لەسەردانی بۆ ئیسرائیل ئەوەی نەشاردەوە، ئامانجی ئەم هاوپەیمانییە دژایەتیکردنی تیرۆرە کە سوریا سەنتەرەکەیەتیو ئێران پشتگیری لێدەکات، تورکیا ڕێگا نادات هەرێمی کوردستان ببێتە زۆنگاوی ئەو تیرۆرە[1].

لەبەرئەنجامی ئەم ڕێکەوتنە، تورکیا توانی بە سوود وەرگرتن لە تەکنۆلۆجیای سەربازیو ئەزموونی ئیسرائیل، هەروەها بە هاوکاریی لەگەڵ هێزەکانی پ.د.ك ودواجار بەکارهێنانی هێزی قروچی-واتە لادێ نشینەکان، پشتێنەی ئاسایش لەگەڵ هەرێمی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٧ پێك بهێنێت، هێڵی ئێران-پ.ك.ك-سوریا بپچڕێنێتو ناوچەکە بکاتە بەربەستێك لەبەردەم چالاکییەکانی پ.ك.ك[2]. لەم پیلانەدا فڕۆکەکانی ئیسرائیل بە بەکارهێنانی ئاسمانی تورکیا، چاودێری وردی سوریا-عێراق-ئێران یان دەکرد[3].

لە چوارچێوەی هێرشی بەربڵاوی تورکیا لە هەرێمی کوردستان، سوپا، ٩ گەریلای پ.ك.ك. ی خستە بەرچاوی ڕاگەیاندن کە هەڵگری ناسنامەی سوری بوون[4]، هەر لەم بارەیەوە تورکیا پێوانەی باشبونی پەیوەندییەکانی لەگەڵ سوریا بە ڕێژەی دەسبەرداربونی سوریا لە هاریکاری پ.ك.ك دەستنیشان کرد[5].

لە ئۆکتۆبەری١٩٩٨ تورکیا سوریای تۆمەتبار کرد بە پشتگیریکردنی تیرۆر دژی تورکیاو داڵدەدانی ئۆج ئالان و فەراهەمهێنانی سەربازگەی مەشق بۆ پ.ك.ك، لەم بارەیەوە تەنگژەیەکی سیاسیی ئاڵۆز لە نێوانیان پەیدا بوو، پاش ئەوەی دیمریل ڕایگەیاند کە تۆڵە لە سوریا دەکاتەوە، هەروەها سەرەك ئەرکانی سوپا بە ئاشکرا وتی: تورکیا لە باری شەڕێکی ڕانەگەیەندراو دایە لەگەڵ سوریا. مۆڵەتی ٤٥ ڕۆژی بە سوریادا بۆ بەدەستەوەدانی ئۆج ئالان، لێرەوە سوپا کەوتە ئەوپەڕی ئامادەباشیو لەسەر سنووری سوریا مۆڵ بوو، لە بەرامبەردا سوریا درکی بە بەهێزی سوپای تورکیاو هاوپەیمانەکانی کرد، سەرئەنجام ڕێکەوتننامەی ئەدەنە ی لە ٢١/ئۆکتۆبەر/١٩٩٨ لەگەڵ تورکیا واژۆ کرد، بەو پێیە سوریا بەڵێنی دا تەواوی سەربازگەی پ.ك.ك لە خاکەکەی دابخاتو ڕێگەی نەدات خاکەکەی

1 روبرت نولسن : المسألة الكردية، ل/٨٦ .

2 رسالة جلال طالباني: تركيا تباشر اقامة حزامها العدواني، التواجد التركي والحزام الامني، ١٩٩٧/١١/٦ .

3 خليل على مراد: دوافع التحالف التركي — الصهيوني، مجلة دراسات سياسية، العدد الثاني السنة الاولى، ١٩٩٩، ل/٢١.

4 عايدة على سرالدين: دول المثلث بين فكي كماشة، ل/٢٦٥ .

5Alain Gresh: from the golf to Kurdistan، winds of war ruffle the middle east1997-2006 Le Monde diplomatique. .www.mondediplo.com.com

بەکاربهێنرێت بۆ هێرشکردنە سەر تورکیا، زیاتر لەوە سەرکردەکانی دەربکات، لەم بارەوە هاریکاری ئاسایشی لەگەڵ تورکیا دەکات، تورکیا لای خۆیەوە جەختی لەسەرئەوە کردەوە رێگا بەهیچ چالاکیەك دژی سوریا لە ناوخۆی دەوڵەتەکەی نەدات[1]، هەر لەم رێکەوتنە سوریا پ.ك.ك ی وەك رێکخراوێکی تیرۆریستی ناشەرعی سەلماند[2]، لەکۆتاییدا ئەم رێکەوتنە گەورەترین کاریگەریی لەسەر هەرێمی کوردستانو، لاوازبوونو کپبوونی چالاکیەکانی پ.ك.ك بوو هەروەها نزیك بوونەوەی وادەی دەستگیر کردنی عەبدوڵڵا ئۆج ئالان هەبوو، کە دوای ئەوە لەسوریا دەسبەرداری بوو، پەنای بردە چەند وڵاتێکی دیکە، لەوانە روسیاو ئیتالیا، یۆنان، دواجار لە ۱٥/ فەبرایر/۱۹۹۹ لەکینیا دەسگیرکراو درایە دەست تورکیا[3].

## تەوەرەی سێیەم

### ئێران:

دووەمین جەنگی کەنداو بۆ ئێران نزیکبونەوەی ئەمریکا بوو بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە کەنداوی فارسی، هەروەها بە ناڕاستەوخۆیی لە هەرێمی کوردستان. هەرچەندە ئیران بێلایەنی خۆی لەو جەنگەدا راگەیاند[4] و بەشێوەیەکی باش ئەم سیاسەتەی لە دەریای فارسیدا پەیڕەوکرد، بەڵام لەهەرێمی کوردستان ستراتیجی ئێران سێ روانگەی جیاوازی بەرامبەر عیراقو هەرێمی کوردستانو تورکیا هەبوو:

○ **دەوڵەتی عیراق:**

عیراقێکی یەکپارچە زامنی سەقامگیری ئێران بوو، چونکە لەڕووی پێکهاتەی ئاینیو نەتەوەیی وەك عیراق مەزهەبی شیعەو سونیە، نەتەوەی فارسو ئازەرو کوردو بەلوجو عەرەبی لەخۆ گرتبوو، کە بەدابەشبوونی دەوڵەتە هاوسێکەی، کاریگەری سلبی لەسەر ئێران

1 خليل علي مراد: دوافع التحالف التركي — الصهيوني، مجلة دراسات سياسية، العدد الثاني، السنة الاولى، ۱۹۹۹، ل/۷۱.

2 هدى درويش: العلاقات التركية اليهودية وأثرها على البلاد العربية، الجزء الثاني، دار القلم، دمشق، ل/۲۰٤.

3 يوسف الجمهاني :اوج الان، ل/۸۳-۹۰ .

4 جیهانگیر کەرەمی: سیاسەتی ئێران بەرامبەر بە کوردی عێراق، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە/۳ ، ساڵی هەشتەم، ۲۰۰۰، ل/۱۷۲.

پەیدا ئەکرد، لێرەدا ستراتیجی ئێران بەرامبەر عیراق پابەندبوون بوو بە یەکپارچەیی خاکی عیراق‌و لەسەر ئەم بنەمایە بەشداری لە کۆبونەوەی سێلایەنە ی ساڵی۱۹۹۲دا کرد[1] .

ئێران سیاسەتێکی دوولایەنەی لەبەرامبەر عیراق پەیرەوکرد، یەکەمیان بریتی بوو لە هەڵکردن لەگەڵ رژێمی عیراق، هەرچەندە لەدووەمین جەنگی کەنداو بەدۆڕاوی دەرچوو، لەگەڵ ئەوەشدا رژێمەکە خۆی راگرتبوو، هەروەها زۆرترین سنووری لەگەڵ هاوسێکانیدا بەدەستەوە مابوو بەتایبەت لەگەڵ ئێران، لەم روانگەوە ئێران پەیوەندییەکی واقیعیی لەگەڵ عیراقدا هێشتبۆوە[2]، دووەمیان سیاسەتی دالدەی هێزە بەرهەڵستکارەکانی عیراق بوو، کە سیاسەتی دوورخایەن بوو بەرامبەر عیراقێك کە ئەگەر لە داهاتوودا پێکهاتەی سیاسیی نوێی بەخۆوە گرت، ئەوا ئەو هێزانە لە عیراقی نوێدا نەخشێکی گرنگیان دەبێت‌و لە ناو بازنەی ئێراندا بن بۆ دژایەتیکردنی ئەمریکا[3]. بۆ ئەم مەبەستەش ئێران بنکەی چەند هێزێکی بەرهەڵستکاران بوو بەتایبەت شیعە مەزهەبەکان لەوانە پارتی بانگەوازی ئیسلامی عیراق و ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عیراق کە خاوەنی زیاتر لە ۱۰ هەزار چەکدار بوو.

### ○ هەرێمی کوردستان:

ئێران بە پەیدابوونی هەرێمی کوردستان لە ساڵی ۱۹۹۱ چەند مەترسییەکی بۆ پەیدا بوو، لەوانە پەرەسەندنی دەسەڵاتی ئەمریکاو تورکیا لە هەرێم، کاریگەریی نائارامی ناجێگیری هەرێم لەسەر ئێران، جێگیربوونی بەرهەڵستکارانی ئێرانی‌و دزەکردنیان بۆ ناو خاکەکەی[4]، بۆ ئەم مەبەستە سیاسەتی بەرامبەر هەرێمی کوردستان بەم شێوەیە بوو:

### • پەیرەو کردنی سیاسەتی مرۆیی:

ئێران بە پێچەوانەی تورکیاوە، سنووری بە رووی زیاتر ۱,۵ ملیۆن ئاوارەی کورد لە ساڵی ۱۹۹۱ ئاوەڵاکرد[5]، هەر رۆژێك ۱۰ ملیۆن دۆلاری لە بۆدجەی دەوڵەت لەم پێناوەدا بەخشی.

---

1 ذبیح الله مهدی پور: کوردستان عراق و سیاستهای اسلامی أیران، ترشیدیة راقه ، شمارة سوم، ۱۳۸۱، ل/۵۸- ۵۷.

2امیر در بابان علی شمخانی: استعداد بحران أفرینی دولت عراق وسیاستهای ایران، مجلة سیاست دفاعیّ۹، شمارة ۲۶-۲۷، ۱۳۷۸، ل/۱۷-۱۸.

3 جیهانگیر کەرمی: سیاسەتی ئێران بەرامبەر کوردی عێراق، ل/۱۷٤.

4 هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل/۱۷۳-۱۷٤.

5Human rights watch :The 1991 uprising in Iraq and its aftermath ،copyright June 1992 Number: 92-72351،www.hrw.org.

- **بەشداریکردن لە پیلانی ناوچەیی:**

ئیران بە چاوی گومانەوە لە مامەڵەی مرۆیی هێزە هاوپەیمانەکانی دەروانی لە هەرێمی کوردستان، وەك دابەشبوونی عیراق‌و دروستکردنی ئیسرائیلی دووەم راڤەی بۆ دەکرد[1] لەبەرئەمە زۆر بەخێرایی وەڵامی پێشنیاری تورکیای دایەوە لە پێناو بەناوچەییکردنی کێشەی کورد لە سنووری سیاسەتی تورکی-ئێرانی-سوریی، سەرەك کۆماری ئێران عەلی هاشمی رەفسنجانی لە میانەی کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرەك کۆماری تورکیا بەڕاشکاوی رایگەیاند ئەستەمە دەوڵەتی کوردی پێکبێت[2] .

- **کۆکردنەوەی زانیاری:**

لەدوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ ئێران یەکەم بارەگای خۆی لە قەزای سۆران سەر بە پارێزگای هەولێر بە ناوی قەرارگاه دیانا کردەوە، کاری فەرمی نوێنەرایەتیکردنی ئێران بوو، هەروەها رێکخستن‌و هەماهەنگی بوو لەگەڵ پارتەکانی هەرێمی کوردستان، بەڵام لە راستیدا چەند کارێکی تری دەکرد لەوانە زانیاری کۆکردنەوەو سیخوڕی لەبارەی رێکخراوەکانی رۆژئاواو بەرهەڵستکارانی کوردی رۆژهەڵاتی کوردستان، کاری بازرگانی نایاسایی وەك کڕینی ئامێرە گرنگەکانی ژێرخانی ئابووری کوردستان، ئەم بارەگایە لەدوای دامەزراندنی حوکمەتی هەرێمی کوردستان گواسترایەوە هەولێرو بەناوی نوسینگەی ئەربیل بۆ پەیوەندییەکانی ئێران کەوتە گەر، پاشان نوسینگەی ئێرانی بەناوی قەرارگاه لەشارەکانی دهۆك‌و هەولێرو سلێمانی‌و سەلاحەدین‌و دەربەندیخان کرانەوە کە نوێنەرانی رابەری ئیسلامی ئێرانی‌و گاردی شۆڕشی پاسداران و وزارەی هەواڵگری اطلاعات و وزارەتەکانی دەرەوەو ئابووری تیایدا دەستبەکار بوون[3] .

- **گورزوەشاندن لەبەرهەڵستکارانی ئێرانی:**

ئێرانییەکان لەهەرێمی کوردستان بەووردی چاودێری پێگەی بەرهەڵسکارانی کوردی رۆژهەڵاتیان دەکرد، بەڵام ئازادیی بەکارهێنانی هێزیان نەبوو لەبەرامبەریان تاکاتێك تورکیا سنوور بەزاندنی کردە پیشەی هەمیشەیی، ئەوە بوو لە ٢٨/ئۆکتۆبەر/١٩٩٢ سوپاکەی رژاندە ناو هەرێمی کوردستان‌و کۆمەڵی نێودەوڵەتیی لەئاستی رێگرنەبوون، ئێران وەك چاولێکەرییەکی تورکیا، لە ٣١/ ئۆکتۆبەر/١٩٩٢ فڕۆکەکانی لەسنووری پارێزگای سلێمانی

---

1 نادر ئینتسار: ئیتنۆنەتەوایەتیی کورد، ل/٣٣٢.

2 روبرت اولسن: المسألة الكردية، ل/٦٥.

3 نبذة مختصرة عن التواجد الايرانى فى كردستان العراق بعد الانتفاضة، ١٩٩٥.

بۆردومانی بەرهەڵسکارانی کوردی رۆژهەڵاتی کوردستانی لە ناوچەی زرگوێزی سەر بەپارێزگای سلێمانی، کرد[1] .

ئەم پێشێلکاریانە، بەردەوام جێگای نارەزایی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان بوون، تائەوکاتەی شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا، کە لەلایەن دەوڵەتانی ناوچەکە قۆستراپەوە، دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان لەبەردەم سوپا گەورەکان دەسەوسان وەستا، سوپای تورکیا بە ٣٥ هەزار سەرباز لە ساڵی ١٩٩٥ بۆ لێدانی مۆڵگەکانی پ.ك.ك سنووری بەزاند، ئێران هاوشێوەی دراوسێکەی لە ٢٦/یۆلیۆ/١٩٩٦ هەمان کاری کرد، ی.ن.ك رێگەی بە ٣-٤ هەزار سەربازی ئێران دا، بەتەواوی چەکی زەمینیو بەقوڵایی٢٥٠/کم بۆ لێدانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هاتە ناو هەرێمەکەو لەقەزای کۆیە سەر بەپارێزگای هەولێر[2]. بەم کارە تەرازووی هێزو هاوپەیمانیەتیی ی.ن.ك- ئێران بەرامبەر پ.د.ك- تورکیا وەستا.

- **گواستنەوەی ململانێی ناوچەیی بۆناو هەرێمی کوردستان:**

شەڕی ناوخۆی هەرێمی کوردستان بۆ ماوەی دوو ساڵ لەلایەن ی.ن.ك و پ.د.ك بەرێوەبرا، راستی شەڕ ئەوەی سەلماند بۆ بەردەوامبوون لەشەرو بەرگریکردن لەبەزین، هاوپەیمانی دەرەکی خۆی دەسەپێنێت، لایەنە سەرەکییەکانی شەڕ، شەرعییەتیان بە دەستێوەردانی ناوچەیی بەخشی. ئەوە بوو تورکیا لەسنووری خۆیدا بوو بەهاوپەیمانی پ.د.ك، لەبەرامبەردا ئێران هەموو نزیکبوونەوەیەکی کوردی-تورکی بەکەمکردنەوەی دەسەڵاتی ناوچەیی خۆی دەزانی. لەبەر ئەوە بەهۆی سنووری پانو بەرینی، بوو بەهاوکاریی ی.ن.ك، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سیاسەتێکی دووڕووی پەیڕەوکرد، بەجۆرێك لەلایەك پشتگیری ی.ن.ك دەکرد، بەتایبەت لەڕووی ئابووریو سیاسییەوە[3]، هاوکات پاڵپشتو پەنادەری بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عیراق* بوو کە بەکاریدەهێنان بۆ بەهێزکردنی بنکەی رەوتی ئیسلامی سیاسی لە دژی هێزە عەلمانیەکان کە لە لایەن رۆژئاواوە پشگیری دەکران[4] .

---

1 رۆژنامەی کوردستانی نوێ : ژمارە/٢٣٣ ، ٤/١١/١٩٩٢٥.

2 کریس کۆچێرا، بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد هیوای سەربەخۆیی، بەرگی دووەم، ل/١١٨-١١٩.

3 کوردستانی نوێ، ژمارە/١٣٥٢، ٦/٨/١٩٩٦.

* ئەم پارتە لەساڵی ١٩٨٦ دامەزراوەو مەلا عوثمان عبد العزیز رابەرایەتی کردوون و لەبەرەی کوردستانیدا بەشدار نەبوون لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ دا هەرچەندە دەنگێکی زۆریان بەدەستهێنا، بەڵام کەمترین رێژەی ٧٪ یان بەدەستهێناو کورسییان لەپەرلەماندا بەدەستنەهێنا، ئەم پارتە لە ساڵی ١٩٩٣-١٩٩٧ بەردەوام لەگەڵ ی . ن . ك لە جەنگدا بووە .

4 وثائق الادانة، منشورات الاتحاد الوطني الكردستاني، دمشق، ١٩٩٤، ل/٧٩-٨٤.

ی.ن.ك لەساڵی ١٩٩٦ بۆ دەسبەرداربوونی ئێران لەسیاسەتی دوور لەشەڕی ناوخۆ، ڕێگەی بەگاردی شۆڕشگێڕی ئێراندا سپاه پاسداران، خاکی ژێردەسەڵاتی ی.ن.ك بەکاربهێنن بۆ هێرشکردنە سەر حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. لەبەرامبەردا ئێران نەك هەر ئەوەی بزووتنەوەی ئیسلامی بێلایەن کرد، بەڵکو لە ١٧/یۆلیۆ/١٩٩٦ ی.ن.ك ی لەپشتیوانی تۆپخانەی ئێرانی بۆ سەر پ.د.ك بەهرەمەند کرد[1] .

دەستێوەردانی ئێرانی وەڵامێکی توندی لەلایەن عێراقەوە پێگەیشت، کە ڕووداوی ٣١/ئۆگستۆس/١٩٩٦ بوو، دوابەدوای ئەم هاوپەیمانێتیە تورکیا بڕیاری پێکهێنانی پشتێنەی ئەمنیدا، ئەمە ئەو باوەڕەی لای ئێران پەیداکرد کە شکستی ی.ن.ك بە پیلانی پ.د.ك-بەغداد-ئەنقەرە بوو، هەر بۆیە ئێران لە ٩/سێپتەمبەر/١٩٩٦ بڕیارەکەی بە پێشێلکردنی یەکێتیی خاکی عێراق داناو بە زیاتر شڵەژانی ناوچەکەی لەقەڵەم دا[2] .

ئێران ئەندامو چەکدارەکانی ی.ن.ك ی لە ١/یۆلیۆ/١٩٩٦ بەدواوە تایەك مانگ لەسەر سنووری خۆی وەك ئاوارە مامەڵەی لەگەڵ کردن، یارمەتییەکانی هاوکات بوون لەگەڵ خۆڕێکخستنەوەی هێزی ی.ن.ك، کە لە ٩-١٣/ئۆکتۆبەر/١٩٩٦، تەواوی شوێنەکانی پێشووتر، جگە لەشاری هەولێر لەدەست پ.د.ك سەندەوە، بەم سەرکەوتنە جارێکی تر تەرازووی هێز لە هەرێمی کوردستانو ناوچەکەدا پارسەنگ بوو. بەڵام ئەوەی ئێرانی لە گۆڕەپانی هەرێمی کوردستان دوور خستەوە ڕێکەوتننامەی ئەنقەرە بوو، بەپێی بەندی/٤ هەردوو لایەنی شەڕکەر ڕێکەوتن داوای دەستێوەردانی دەوڵەتی دراوسێ نەکرێت، ئەم مافە تەنها تورکیا بەپێی خاڵەکانی تر مسۆگەری کردبوو[3]، لەم خاڵەوە ئێران ڕێکەوتنەکەی بە پیلانێکی ئەمریکایی ئیسرائیلی ناوبرد، بۆ پێکهێنانی ئیسرائیلی دیکە لەناو هەرێمی کوردستان[4] .

### ○ تورکیا:

کێشەی کورد لەنێوان تورکیاو ئێران لەنەوەدەکان، لەدوو بازنەدا بەم شێوەیە سوڕی خوارد:

---

1کریس کۆچێرا، بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد هیوای سەربەخۆیی، بەرگی یەکەم، ل/١٥٧-١٥٨.

2 جلال عبدالله معوض: صناعة القرار فی ترکیا، ل/١٦٩.

3 بڕوانە دەقی ڕێکەوتنامەکە ،پاشکۆی ژمارە/٤ .

4 Michael M. Gunter: Turkey and Iran Face off in Kurdistan. MARCH 1998 • VOLUME V: NUMBER *Middle East Quarterly*/ www.mefervm.org.

## یەکەم: بازنەی هەرێمی کوردستان:

لەدوای ساڵی ١٩٩١ هەر لایەك لە تورکیاو ئێران بەجۆرێکی تایبەت مامەڵەی لەگەڵ هەرێم دەکرد. هاوکات وەك سڵەمینەوە لەرەوشی سیاسی هەرێمی کوردستانو شکستهێنان بە ئەزموونی کوردی، هاریکاری هەمەلایەنەیان دەست پێکرد، کۆبونەوەی سێلایەنە، هاورێ لەگەڵیدا رێکەوتنی دوو قۆڵیی نێوانیان، لەم چوارچێوەیەدا بەرجەستەبوو، ئەوەبوو لەساڵی ١٩٩٤ لەسەرئەوە رێکەوتن رێگە بەهیچ گروپو کۆمەڵێك نەدەن خاکی خۆی دژی ئەوی دیکە بەکار بهێنێتو زیان بە ئاسایشی نەتەوەیی هەردوولا بگەیەنێت[١].

ئەگەرچی تائێرە جیاوازیی لەبیرو بۆچوونی نێوانیان نەبوو، بەڵام ناکۆکی لەو خاڵەوە دەستیپێکرد، هەرلایەك لەهەرێمی کوردستانەوە یاریدەی کوردە بەرهەڵستکارەکانی ئەوی دیکەیدا[٢] حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەرێگەی تورکیا پاڵپشتی نێودەوڵەتیی بۆ لێدانی ئێران پەیدا کرد[٣]، لەبەرامبەردا پ.ك.ك لەساڵی ١٩٩٤ بەدواوە لەلایەن ئێران هاوکاریی کرا، ئەوەی ئەو کارەی ئاسان کرد، ئۆردوگای زەڵێ ی نزیك سنووری ئێران بوو، جوگرافیای هەرێم، حکومەتی هەرێمی کوردستانی ناچارکرد بۆ بەرگرتن لەدەستێوەردانی تورکیاو عێراق تەنها لایەنی ئێران دەمێنێتەوە کە ئۆردوگای پ.ك.ك ی لێدابنێت، بەڵام ئێران شەری ناوخۆی قۆستەوە بۆ پاڵپشتیکردنی پ.ك.ك، کە لەشکرکێشی تورکیای فراوانو بەهێزترکرد بۆ ناو هەرێمی کوردستانو بارودۆخی هەرێمەکەی ئاڵۆزتر کرد، هاوکات پەیوەندییە دوو قۆڵییەکانی نێوان تورکیاو ئێرانی ئاڵۆز کرد.

رووداوەکانی هەرێمی کوردستانو چالاکبوونی پارتە بەرهەڵسکارەکانی کورد، وایکردکە ماوەی لێك دابرانی نێوان تورکیاو ئێران هێندە درێژە نەکێشێت، ئەوەبوو ٨/سێپتەمبەر/ ١٩٩٥ لە تاران سوورێکی تری کۆبونەوەی سێلایەنە دەستی پێکردو وەزیری دەرەوەی تورکیاو ئێرانو سوریا لەسەر سێ خاڵ رێکەوتن کەبریتی بوون لە:

- رەتکردنەوەی دابەشبوونی عێراق .
- رەتکردنەوەی تیرۆر بەبێ دیاریکردنی لایەنێك .
- نیگەرانی دەربرین لە شەری ناوخۆی هەرێمی کوردستان[٤] .

---

1روبرت اولسن: المسألة الكردية، ل/٦٤-٦٥.

2 Michael M. Gunter: Turkey and Iran Face off in Kurdistan. MARCH 1998 • VOLUME V: NUMBER *Middle East Quarterly*/ www.mcfervm.org .

3 روبرت اولسن: المسألة الكردية، ل/٦٢. كمال مجيد: النفط والاكراد دراسةفى العلاقات العراقية-الايرانية-الكويتية.دار الحكمة، لندن، ١٩٩٧ ، ل١٥٢ .

4 روبرت اولسن : المسألة الكردية : ل/٦٧.

## دووەم: بازنەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست:

بازنەی کێشەی کورد لە نێوان ئێران و تورکیا فراوانی بەخۆوە بینی لەدوای حوکم گرتنەدەستی پارتی رەفاه لە تورکیاو توند بوونی شەڕی هەرێمی کوردستان و دەست تێوەردانی سەربازی ئێران لە هەرێمی کوردستان.

بەگرتنەدەستی کورسی حوکم لەلایەن پارتی رەفاه لەناوەراستی ١٩٩٦، تەوژمی ئیسلام گەری لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتیو لەتورکیا بەتایبەتی پەرەیسەند، کە جێگای خۆشحاڵیی کۆماری ئیسلامی ئێران بوو، نوێنەری ئێران لە تورکیا، لە بۆنەیەکی ئیسلامی لە شاری سنجان رایگەیاند، "پێویستە کۆمەڵگە شوێنکەوتەی شەریعەتی ئیسلام بێتو لەتۆمەتی توندڕەوی نەترسێت"، ئەمە لەلایەن سوپای تورکیا بە هێرشکردنە سەر عەلمانیەت لەقەڵەم درا، بوو بەهۆکاری سەرەکیی دەرکردنی نوێنەری ئێران لە ئەنقەروە، هەروەها یەکێك بوو لە پاڵنەرەکانی دوورخستنەوەی پارتی رەفاه لە دەسەڵات[1] . ئەم پچڕانە لە پەیوەندییەکان بە هاتنی باڵی چاکخوازی لە ئێران بە سەرۆکایەتیی محەمەد خاتەمیی کۆتایی هات، دیمریل بانگێشتی تاران کرا بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی جیهانی ئیسلامی، بەڵام لەبەر ئەو رەخنانەی لە ئەنجامی لە شکرکێشیی تورکیا بۆ ناو هەرێمی کوردستانو هاریکاریی سەربازی لەگەڵ ئیسرائیل بەرەو ڕووی بوونەوە، بەشداری کردنەکەی هەڵپەساردو گەڕایەوە ئەنقەرە[2] .

بەڵام لەناو هەرێمی کوردستان پارتی رەفاه جڵەوی رەوتی ئیسلامی لەدەست ئێران وەرگرت بەدروستکردنی پەیوەندیی لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق[3]، بەتایبەت کاتێك ئەم پارتە پەیوەندیی لەگەڵ ئێران لەباری متبووندا بوو.

لەڕووی ناوچەییەوە لە شکرکێشیی تورکیا لە هەرێمی کوردستان، نزیکبونەوەی مەترسیەکانی ئیسرائیل بوو وەك هاوپەیمانێکی سەربازی تورکیا لە سنورەکانی لە ئێران، هاوکات فراوانبوونی شریتی نەتەوەی تورکی، بەدرێژایی سنووری ئێران لەڕووی باکوورو رۆژئاوای ئێران، کە نیشینگەی ئازەری تورك نەژادەو زیاتر لە ٢٩٪ ی دانیشتوانی ئێرانەو

---

1هەمان سەرچاوە، ل/٦٦-٦٨.

2Michael M. Gunter: Turkey and Iran Face off in Kurdistan. MARCH 1998 • VOLUME V: NUMBER *Middle East Quarterly*/ www.mefervm.org

3 رابەری بزووتنەوەی ئیسلامی مەلا عوسمان عەبدولعەزیز لە ملنگی ئۆگستۆسی ١٩٩٦ سەردانی ئەنقەرەی کردبوو،کە لەئەنجامدا پشگیری مادی بەدەست هێنا بوو بۆ دژایەتی کردنی پ.ك.ك .بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ : ژمارە/١٣٤٧ ،١٩٩٦/٨/١، روبرت اولسن : المسألە الکردیە، ل/٧٧.

کەلتووری رۆشنبیریی دەوڵەتی تورکی کاریگەری بەسەریانەوە هەیە، ئەمە وایکرد ئێران بەتەواوی لەچالاکیی سەربازی لەهەرێمی کوردستان نیگەران بێت[1] .

## تەوەرەی چوارەم

## ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:

تێڕوانینی ئەمریکا لە دوای دووەمین جەنگی کەنداو بۆ تورکیاو پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەرێمی کوردستان، لەچوارچێوەی پرۆژەی بەرنامەی کارکردنی بوو لە بەرامبەر عێراق، هەرچی وڵاتە هاوپەیمانەکان بوون بەتایبەت ئەو دەوڵەتە ئەوروپییانەی لەو پرۆژەیەدا بەشداربوون، گەرچی راو بۆچوونی جیاوازیان هەبوو، بەڵام بەهێزی ئەمریکا لەسایەی سیستەمی نوێی جیهانیو نەبوونی رکابەرێکی هاوتا لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی سارد، ئەو هێزەی پێدا بوو، ئەگەر هەر دەوڵەتێك لەگەڵ بەرنامەی کاریدا نەبێت ئەوا باشترە بێلایەن بێت نەك لەدژی بوەستێت. لەم روانگەیەوە هێڵە سەرەکییەکانی سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر هەریەك لە عێراقو هەرێمی کوردستانو تورکیا، تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، کە سەرجەمیان لە تەوەرەی دوارۆژی عێراقدا دەسووڕانەوە بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو:

### ١- عێراق:

لە ٢٧/ فەبرایر/١٩٩١ دووەمین جەنگی کەنداو بە فەرمی راگیراو عێراق لە کوەیت دەرکرا بەدور لەوەی ئەمریکاو هاوپەیمانەکان هەوڵی رووخاندنی رژێمی عێراقی بدەن، لەم بارەیەوە سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بۆش ىباوك ،لەو باوەڕەوە هەنگاوی نا، بە رووخاندنی سەدام حسین و رژێمەکەی، ئەمریکا هاوپەیمانە عەرەبیەکانی لەدەست دەدات، دواجار ئەمریکاو ئەو دەوڵەتانەی لەگەڵیدا بوون وەك داگیرکەر لە ناوچەکە سەیر دەکرێن[2]، لەلایەکی تر بەنەمانی سەدام حسین و رژێمەکەی، ئایندەی نادیاری عێراق دەکەوێتە بەردەم ئەو پرسیارەی، ئایە داهاتووی ئەو دەوڵەتە دەکەوێتە دەستی چ هێزو لایەنێك، خودی ئەمریکا

---

1 بهار بدری حسین: سکان ایران، جامعه المستنصریه، معهد الدراسات الاسیویه والافریقیه، سلسله الدراسات الایرانیه، غیر منشوره، بغداد، ١٩٨٦، ل/٦٩-٧٣. روبرت اولسن : المسأله الکوردیه، ل/٥١ .

2Jermy Campbell: evening standard ،17 February1998.لماذا تخلیت عن فکرة الاطاحة بصدام

بەگومان بوو لە ڕێژەی دڵسۆزیو هاریکاریی هێزە بەرهەڵستکارە عێراقییەکان بۆ خۆی یان نەیارەکانی لەناوچەکە، بەتایبەت ئێران[1] .

دوابەدوای کۆتایی هاتنی جەنگ، سەدام حسین بەردەوام بوو لە سەرۆکایەتی کردنی عێراقو سوپاکەی بە تایبەتی کە گاردی کۆماری لێهاتوویی تەواویان نواند، لەسەرکوتکردنی راپەرینی باشووری عێراقو راپەرینی هەرێمی کوردستان، لەگەڵ ئەمەدا رژێمی عێراقی بەپێی بڕیاری ٦٨٧، پابەند کرا بە داماڵینی چەکی کۆکوژ بە سەرپەرشتی لیژنەی تایبەتی سەر بە نەتەوە یەکگرتوەکان، بۆ هەموو ئەمانەو بۆبەرگرتن لە سەرکێشی عێراق، هێزی هاوپەیمانان بەسەرکردایەتیی ئەمریکا لە سعودیەو کوەیتو قەتەرو بەحرەینو عومان بۆ کاتێکی نادیار دامەزران[2] .

دەکرێت لەمیانەی مانەوەی ئەمریکا لە دورگەی عەرەبیدا ستراتیجی کارکردنی بەسەر سێ قۆناغ دابەشبکەین:

**قۆناغی یەکەم :پێکهێنانی ناوچەی دژە فڕین**

بریتی بوو لەو ناوچەیەی کە عێراقی بەسەردا دابەشکرا بوو بەسەر هێڵەکانی پانی بە جۆرێك تەنها لە نێوان هێڵی ٣٦-٣٢ فڕۆکە عێراقیەکان بۆیان هەبوو هەڵفڕن[*]، هۆکاری سەرەکیی ئەم پلانە، ئەو توندوتیژیەی گاردی کۆماری عێراق بوو کە پیادەیکرد لە کپکردنەوەی راپەرینی ١٩٩١ کە بەدوایدا، ئەنجومەنی ئاسایش بڕیاری ٦٨٨ی دەرکردو لەبەر رۆشنایی ئەو بڕیارە ناوچەی دژەفڕین پەیدا بوو[3] .

**قۆناغی دووەم: سیاسەتی الاحتواء المزدوج**

ئەم سیاسەتە بەڕۆشتنی جۆرج بۆشی باوكو هاتنی بیڵ کلینتن بۆ کۆشکی سپی ئەمریکا دەست پێدەکات ١٩٩٢-١٩٩٨، مەبەست تیایدا بەرگرتن بوو لە رۆڵی ناوچەیی ئێرانو عێراق، بەجۆرێك تەواوی کاریگەرییان بۆ دروستکردنی تەنگژەو باری ناجێگیر لە ناوچەکەدا پەك بخات[4] .

---

1علی الشمرانی: صراع الاضداد، ل/١٨٩-١٩٠.

2 ريتشارد كلارك : فی مواجهة جميع الاعداء، ل/١٠١-١٠٢.

* بڕوانە نەخشەی ژمارە/٣ .

3 دانيل بايمن ء بردرهاه: سياسة أمريكا در قبال عراق، برس ضهار سناريو، مترجم : ملايك ملا نظر، مجلة سياسة دفاعی ، شمارة، ٢٦-٢٧، ١٣٧٨ ، ل//٥٦ .

4 وليم كوانت: ماالذی تعنيه سياسة الاحتواء المزدوج ، مجلة ئالای ئيسلام ، عدد ٣ سنة السادسة، ١٩٩٣ل ٩.

**قۆناغی سێیەم: بڕیاری ئازاد کردنی عێراق**

کۆنگرێسی ئەمەریکا لە مانگی ئۆکتۆبەری١٩٩٨ بڕیاری "ئازادکردنی عێراق"ی دەرکرد، وەك سیاسەتێکی روونو ئاشکرا بەرامبەر دیاریکردنی دوارۆژی رژێمی عێراق، کە چارەنووسی لەناوچوونە، بۆئەم مەبەستەش وەك یەکەمین هەنگاو بڕی ٩٧ ملیۆن دۆلار لەلایەن ئیدارەی ئەمریکاوە درا بە بەرهەڵستکارانی عێراق بۆ کارکردن لەپێناو رووخاندنی ئەو رژێمە[1]، دوا بەدوای ئەم بڕیارە جیهان بەگشتی ولاتانی ناوچەییو هەرێمی کوردستان بە تایبەتی پشتڕاست بوونەوە لە ئایندەی عێراق.

## ٢-تورکیا:

پەیوەندیی نێوان ئەمریکاو تورکیا بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ دوای کۆتایی هاتنی دووەمین جەنگی جیهانی، بەپێی باوەڕی "ترومان "و "مارشال"*، ئەمریکا خۆی پابەند کرد بە پاراستنو یارمەتیدانی تورکیا لە بەردەم مەترسییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت بۆ ئەو دەوڵەتە، بۆ ئەم مەبەستە چەند رێکەوتنێك کەوتە نێوانیان کە گرنگترینیان رێکەوتننامەی ساڵی١٩٦٩ بوو کە بەرێکەوتنی هاریکاریی بەرگری ناسرا بوو، بەو پێیە ئەمریکا ٢٦ بنکەی سەربازی بۆ چاودێریکردنی یەکێتیی سۆڤیەت لە تورکیا دامەزراند بە مەبەستی هەواڵگری هێماکان، هەواڵگری پەیوەندییەکان، هەواڵگری ئەلکترۆنی. لە ساڵی١٩٨٠ رێکەوتنی هاریکاریی ئابووری لە نێوانیان بەسترا، کە تورکیای کردە سێیەم دەوڵەت لە دوای ئیسرائیلو کۆریای باشوور لە رووی وەرگرتنی یارمەتی هەمەجۆری ئەمریکا[2].

تورکیا بۆ ئەمریکا جێگای بایەخێکی گەورە بوو، چونکە سەرەڕای ئەوەی خاوەنی دانیشتوانێکی زۆرو هێڵی پەیوەندیی بوو بە جیهانی ئیسلامی، هاوکات خاوەنی سستەمێکی عەلمانی شێوە دیموکراسییو سوپایەکی گەورەو گرنگتر لەوانە پێگەی جوگرافی ئەو دەوڵەتە بوو لە جەنگی سارد، هەروەها هێڵی پێشەوەی روبەڕوبوونەوە بوو لە بەرامبەر سۆڤیەت لە ناوچەکە، هەروەها لە دووەمین جەنگی کەنداو هاوسنووری دەوڵەتی عێراقی بوو کە خاڵی سەنتەری پرۆژەی ئەمەریکی بوو لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست[3].

---

1 دانیل باین ء بردرهات: سیاسة أمریکا در قبال عراق، ل/٥٦.

* بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر پرۆژەی مارشال و ترومان و پەیوەندیی بە تورکیاوە بڕوانە:احمد نوری النعیمی: ترکیا وحلف شمال الاطلسی،المطبعة الوطنیة، عمان، ل/١٤٥-١٥٨.

2Micheal .m Gunter: the Turkish –us alliance in disarrays ،2005، www.faind Articles.com.

3 کمال حسین عمر: ترکیا فی الاستراتیجیة الامریکیة، مجلة متین ،ژمارە/٩١، ١٩٩٩، ل/٧٤-٧٥ .

تورکیا لەدوای دووەمین جەنگی کەنداو تەواوی پشتگیری بۆ ئەمریکا دەربڕی، لە پاداشتی ئەوەدا ئەمریکا ئەو کەنارە ئارامە بوو کە تورکیای لەشەپۆلی کێشەو گرفتەکانی وەك: ئابووری، ناوخۆیی، ئاسایش، سیاسیی، دەپاراست. لەڕووی ئابورییەوە دووەمین جەنگی کەنداو سالآنە زیانی گەورەی بە ئابووری تورکیا گەیاند، سەرەڕای ئەمە جەنگی تورکیا لەگەڵ پ.ك.ك سالآنە کورتی بە بودجەی تورکیا ئەهێنا، ئەمە یەکێك لە هۆکارەکانی وابەستەیی تورکیا بوو بە ئەمریکاوە، چونکە یەکەم دەوڵەت بوو، هەمیشە قەرزی بە پەلەو درێژخایەنی بە تورکیا دەبەخشی[1]، ئەم قەرزانە شێوەی نەختینەو کەلوپەلو دابینکاری سەربازی گرتبۆوە، لە ماوەی سالآنی ١٩٩٣-١٩٩٧ ئەمریکا بڕی ٨،٣ ملیار دۆلار قەرزی سەربازی دا بە تورکیا کە بریتی بوو لە ١٠٠٠ تانکی پێشکەوتوو، ٤٠ فڕۆکەی شەڕکەر، ٧٠٠ گوێزەرەوەی سەربازیو هەروەها نۆژەنکردنەوەی ٤٦ فڕۆکەی جۆری F16[2] .

جۆرێکی تری هاریکاریی ئەمریکا، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، لە ڕێگەی هاوپەیمانی سەربازی ئیسرائیل-تورکیا بوو، کە ئەمریکا بە هاوپەیمانیی دوو دەوڵەتە دیموکراتییەکەی ڕۆژهەلآتی ناوەڕاستی وەسف کرد[3]، بۆ نموونەلە ساڵی١٩٩٥، ٥٠ پسپۆڕی سەربازی ئیسرائیلی خاوەن ئەزموون لە شەڕی لوبنان، بەشداری لەشکرکێشیی ساڵی ١٩٩٥ بۆ هەرێمی کوردستان کردو پلانی نیوە بازنە یان بەکار هێنا بۆ گەمارۆدانی پ.ك.ك لە هەرێمی کوردستان[4]، هەروەها لەشکرکێشیی ساڵی١٩٩٧، بە هاوکاریی پسپۆڕانی ئیسرائیلی – ئەمەریکی، پلانی دێهاتی ستراتیجی بەکارهێنرا لە دژی پ.ك.ك، کە ئەمریکا لەجەنگی ڤێتنام بەکاریهێنا بوو، بەمەبەستی پێکهێنانی بەرگری ناوخۆو بۆ دژایەتی کردنی شەڕی پارتیزانی[5]، ئەمە جگە لەوەی ئەمریکا وەك دیمیریل وتی: ڕۆڵی گرنگی لە دەستگیرکردنی ئۆج ئالان گێڕا[6] .

لەلایەکی تریشەوە ئەمریکا پەیوەندیی بە چەند کێشەیەکی ناوخۆی تورکیاوە هەبوو، وەك بەرهەڵستی کردنی ڕەوتی ئیسلامی کە سەرۆکی پێشوی ئەمریکا جیمی کارتەر دەڵێت:

---

1 James Badcock: Turkey، Kurds and the European Union. 2002. www.nthposition،com

2 Amikam Nachmani :turkey in the wake of the Gulf war ،www.faind Articles.com:

3 Alain Gresh: from the golf to Kurdistan، winds of war ruffle the middle east1997-2006 Le Monde diplomatique.www.mondediplo.com.com

4 رغدة نصيف جاسم الربيعي: التوجه الآسرائيلي، ل/٨٩.

5 Alain Gresh: from the golf to Kurdistan، winds of war ruffle the middle east1997-2006 Le Monde diplomatique. .www.mondediplo.com.com

6 Micheal .m Gunter : the Turkish –us alliance in disarrays ،2005، www.faind Articles.com:

"ئەم کێشەیە وەك بۆمبێکی کاتی وایە لە تورکیا"، هەروەها گەورەترین پشتیوانی تورکیایە بۆ چوونە ناو یەکێتیی ئەوروپاوە[1]، هەموو ئەمانە وایان کرد تورکیا پاشکۆی سیاسەتی ئەمریکا بێت.

سەرەڕای هاوپەیمانیەتیی نێوان ئەمریکاو تورکیا، چەند خاڵێکی ناکۆك لە نێوانیان هەبوو، یەکێك لەو خاڵانە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ بوو لە تورکیا، بە تایبەت لە کوردستانی باکوور ئەوە بوو لە ساڵی١٩٩٤، یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ دیموکراتیو مافی مرۆڤ هارۆڵد کوه، لە سەردانێکی بۆ ئەنقەرە رایگەیاند تورکیا مافی خۆیەتی رێگە لە تیرۆر بگرێت، بەڵام نابێت مافی مرۆڤ پێشێل بکات[2]، هەروەها کۆنگرێسی ئەمریکا سەبارەت بەمافی مرۆڤ ئەوەی خستەڕوو لە ساڵی ١٩٩٥ چەکی سەربازی ئەمریکا لە بەرامبەر خەڵکی سڤیل بەکار دێتو دەوڵەتی تورکیا بۆتە هۆی رووخانی ٣٠٠٠ گوندی کوردو ناچارکردنی دوو ملیۆن کەس بۆ بەجێهێشتنی زێدی خۆیان[3].

تەوەرەیەکی تری ناکۆکی نێوانیان هەرێمی کوردستان بوو، بە تایبەت لەوکاتانەی سەرکردایەتیی کورد سەردانی ئەمریکای دەکرد، یان دەنگوباسە جیهانییەکان بایەخیان بە کێشەی کورد دەدا، ئەمە تورکیای راڕاو بەد گومان دەکرد لە ئامانجی ئەمریکا، لەم بارەیەوە قسەکەری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ریچارد باوچەر لە ٨/ئۆکتۆبەر/١٩٩٢، سیاسەتی ئەمریکای سەبارەت بەپەیوەندیی کوردو ئەمریکا بەم شێوەیەی خوارەوە خستەڕوو:

- پ.ك.ك رێکخراوێکی تیرۆریستییە .
- ئەمریکا بەردەوام ئیدانەی پ.ك.ك دەکات .
- ئەمریکا پشتگیریی هەوڵەکانی تورکیا دەکات لە پێناوی پاراستنی مافی رۆشنبیریو سیاسیی هاوولاتی بە رەگەز کوردی تورکیا.
- ئەمریکا پشتگیری شەڕی تورکیا لە دژی تیرۆردەکات.
- ئەمریکا بە توندی پشتگیری یەکێتیی خاکی عێراقو تورکیا دەکات[4] .
- هەرێمی کوردستان.

پەیوەندییەکانی کورد لەگەڵ ئەمریکا لە مێژووی هاوچەرخدا چەند ئەزموونێکی تاڵیان بە خۆوە بینیوە کە ئەمریکا هانی کوردی داوەو پاشان دەسبەرداری بووە، یەکەمیان ساڵی

---

1کمال حسین عمر: ترکیا فی الاستراتیجیة الامریکیة، مجلة متین ،ژمارە/٩١، ١٩٩٩، ل/٧٥.

2Micheal .m Gunter: the Kurdish question in perspective.www.find Articls.com. LEE H.

3 LEE H. hAMILTON: PROPOSED SALE OF ARMY TACTICAL MISSILE SYSTEM TO TURKEY، Page: E2333] *MONDAY، DECEMBER 11، 1995* thomas.loc.gov\hower\rlo2query.htm

4 ترکیا واعلان الدولة الکردیة فی الشمال العراق، ل/٥.

